# پێرست

## دەسپێک

*کاملی گر خاک گیرد زر شود*
*ناقل ار زر برد خاکستر شود*
*مولاتا*

زمان لە خۆیدا چێژێکی تایبەتی هەیە. خوێنەر یا بیسەر بێئەوەی شارەزاییەکی ئەوتۆی لە سەر جوانیناسی زمان هەبێ، بە وتە یا نووسراوەی جوان هەستی دەبزوێ و گیانی دەگەشێتەوەو چێژی لێ دەگرێ. وەک چۆن پێویست نییە کەسێک گوڵناسێکی پسپۆڕ بێ بۆ ئەوەی بۆنی خۆش هەست پێبکاو بەهرەی لێ ببا، زمانیش ئاوەهایە. بەڵام دیارە هەر وتەیەک جوان نییە و نابێتە زاخاوی مێشک. دیارە ئەو بۆن و بەرامەیە کە تخووبی پەیڤەکان لێک جیا دەکاتەوە، نوێنەری ئاخێزگەی ئەو وتانەن. هەوەها بیرێکی کورت و دەروونێکی ناپاک کاتێ لە بیچمی قسەدا خۆی دەنوێنێ، تاڵی و رەشی و رق و قینی لێوە دەبارێت.

پەیڤ هەرچەن ساکارترو پاراوتر بێ، پەتیترو بێپەردەترەو هەروەها بەدەوترو جوانتر. بە گورجی کونج و بناوانی دڵ و دەروونی دەتەنێتەوەو وەکوو بیسەر خۆی بیسراوی وتبێت، وای بە دڵەوە دەنووسێ کە قەد گومان لە هەڵە بوونی ناکات. نەک بڵێم هەڵەی تێدا نییە، بەڵکوو رەنگە زۆرجاریش هەڵەکانی زۆرتر بن، بەڵام ئەو یەک لانی و یەک لۆنییەی، لە سەر زەینی مرۆڤ کاریگەر دەبێ.

گەلێک جار بەرفراوانی وێژە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەر پەیڤێک بخرێتە نێو بازنەی وێژەوە. دان بەوەدا دەنێم کە وێژەو ئەدەب هەموو کونج و قوژبنەکانی زانستە جۆراوجۆرەکان دەگرێتەوەو هەرجۆرە نووسراوەیەک لە هەر بوارێکدا کە بێ، ئاسەواری ئەدەبی تێدایە؛ بەڵام بەر لە هەر هونەرێکی تر —بە تایبەت ئەدەب- بیرو هزر دێتە ئاراوە. ئەوی راستی بێ ئافراندنی وتە بە هۆی هزرەوەیە. کەواتە هەر قسەیەک دەنگدانەوەی فەلسەفەیەکی تایبەتە. رەنگە ئێمە وەکوو زانست، فەلسەفەمان نەبێ، بەڵام بێگومان بیری

فەلسەفیمان هەبووەو هەمانە. چۆن دەبێ وەکوو نەتەوەیەکی خاوەن شارستانییەت بیری چۆن ژیان و چۆن دوانمان نەبووبێ.

بە رای من رشتەی مرواری نەک کۆمەڵەیەکی ئەدەبی تەنیا، بەڵکوو کۆمەڵەیەکی هزری و فیکری کۆمەڵگای کوردییە. لەم بەرهەمە بە نرخەدا لە زمانی مەردۆمێکی ئاسایی و زۆرجار نەخوێندەوارەوە پەندو قسەیەک دەبیسین کە -بە رای من- زۆر لە زاناو فەیلەسووفان بۆ تێگەیشتنی مێشکیان سواوەو هەم خۆیان هەم خەڵکیان وەڕەز کردووەو لە ئەنجاما نەخۆیان تێگەیشتوون نە خەڵکی. کەچی نەخوێندەوارێکی رەمەکی بە زمانێکی ساکار و پاراو و لە ناخی دڵێکی بە کوڵەوە بەبێ ئەوەی رێ بدا زمان، بیری ئاڵۆزو شێواو کا، دەیڵێتەوە. بۆ نموونە رازو نیازێک لە زمانی پیرێکی نەخوێندەوارە دەبینین کە بە مەنتقێکی ساکارەوە دەڵێ:

*بینایی چاوان! نازانم بێژم تۆ چیت؟ ئەوەن ئەزانم ئەها ها ئەوەی کە تا چاو بڕئەکا لەو درێژی ئاسمانە تۆ گشتت دروست کردگە. هەر بڕۆ، هەر بڕۆ، هەر ناوڕێتەوە. پیاو وا ئەزانێ ئەوە بڕایەوە، کەچی هەر لە هەولیەوەس. ئەگەر من دوو باڵم هەوێ و بڕۆم وەو ئاسمانەدا باڵەکانم شل ئەون و وا ئەزانم چووگم، کەچی ئاسمان هەر دوورتر ئەوێتەوە، گەرمە هەسوونێکم بەرچاو کەوێ کەچی هیچ دیار نییە. کەواتە تۆ ئاسمانت وەبێ هەسوون راگرتگە.*

یاخۆ ئەو بیرانەی کە لە سروشت و جیهان هەیەتی بەڕاستی کە جێگای رامانە:

*... تۆ دەست وە گشت شتێکەوە ئەژەنیت، کەچی تۆیش دیار نیت. رزقی مار و مێروو ئەدەی لە پشت پەردەی غەیوەوە، کەچی ئەگەر من بێمە ئەو پشت پەردەیە تۆ لە وێش نیت. تۆ دەریا گەورەکان وە «زریوار»یشەوە هەندێ جار ئەیانکەی وە یەخ، هەندێ جار ئەیانکەی وە ئاوی رووت، کەچی ئەو گشت گیاندارانە لە ناویانا هەر هەڵئەقونینەوە. بەشی گشتیانت داگە، نایەڵی کەسیان وەبێ‌رزق سەر بنێتەوە. من ئەو گیانەی لە بەرمایە تۆ داتنیاگە لە گەڵ ئەوەدا کە وەمنەوەیە، من نازانم چییە. دەست ئەدەم وە دەوارەوە هەڵیئەدەم ئێژی رۆستەمم، کەچی نازانم ئەو زۆرە چییە کە تێمدایەو دەوارەکە هەڵئەدەم.*

*ئەو دەشتی «مێرگەپانە» لەوەختی بەهارا -خوا نەیورێ- پڕیەسی لە هەلالەو بەیبوون؛ هەر گولێ وەرەنگێ رەنگ ئەداتەوە؛گشتی تۆ دروست کردگە. من وەم فرەزانی خۆمەوە سەرم تیا سڕ ماگە، نازانم چییە یەک تۆمە پەڕەی گولەکەی پەلێکی سوورە، پەلێکی کەوەس، خەتێکی زەردەوامە، تۆ لە گشتیا هەیت، کەچی وەچاویش ناوینرێت.*

یا لە زۆر شوێندا پەندی زۆر جوانمان دێتە بەرچاو کە بە راستی دەبێتە زاخاوی مێشک. ساکاری ئەم قسانە لە ئاستێک دان کە خوێنەر دەباتە ناو دەریای بیرو ئەندیشەوە. زۆرجار ئەزموونی سەدان و هەزاران سالەمان دێتە بەرچاوی دڵ و بیرەوە؛ ئەزموونگەلێک کە وەکوو هەتاو تیشک دەبارێننە سەر ڕێگای تاریک و پڕلە هەورازی ژینەوە. ڕەوت و شێوازی ژیان و هەلسوکەوت هەم لە گەڵ خێزانی ماڵ و هەمیش لە گەڵ کۆمەڵگا.

زۆرجار دەڵێن نەتەوەی کورد فەلسەفەی نەبووە. ڕەنگە ئەم قسە تا رادەیەک راست بێ. ئێمە نە سوقراتمان بووە، نە ئەفلاتوون‌و نە ئەرەستوو. ئێمە -بە داخەوە- نە خێوی «جمهور»ین، نە «مابعدالطبیعه»و نە «غاطیقوریاس»و نە هیچ کتێبێکی‌تر(تا ئەو جێگا من ئاگادار بم). بەلام ئەگەر لەو ئاسەوارە بەنرخ و هێژایانە ورد بینەوە، چ دەبینین؟ بە گشتی فەلسەفەیان لە سەر ئەم بابەتانەی خوارەوەیە:

ئاکار، بیر لە بوونی خوا، خۆشەویستی خوا، سیاسەت و بەڕێوە بردنی ولات، سیاسەتی بەڕێوەبردنی بنەماڵەو بە گشتی دیتنەوەی ڕێگای ژیانی بەختەوەرانە.

نامەوێ لە پلەو پایەی ئەو گەورانە -کە بە راستی کۆمەڵگاکانی مرۆڤ بە گشتی منەتبارریانن- کەم کەمەوە؛ بە پێچەوانە بە تەمام بلێم ئێمەش وەکو نەتەوەیەکی خاوەن شارستانییەت فەلسەفەو بیرو هزرمان هەبووەو بەو پێیە ژیاوین.

دیارە دوان لە سەر ئەم بابەتە کات و شوێنی تایبەتی ئەوێ و لەم دەسپێکەدا جێگای ئەوە نییە بە تێرو تەسەلی لەسەری بڕۆین.

بە گشتی رشتەی مرواری کارێکی ئێجگار بە نرخی ماموستا سەجادییە کە لە زاری خەلکی بیستووەو کۆی کردۆتەوە. لەم سۆنگەوە رشتەیەکی خوشیک و جوانە لە زاراوە جۆراوجۆرەکانی زمانی کوردی کە بە شێوەی ساتیر و هەجوو کومیک بێژراوەو تۆمار کراوە.

رەنگە لە زمانی کوردیدا یەگانە بەرهەمێک بێت کە بەم ئۆسلۆبە نووسرابێ؛ واتە قسەی قووڵ و پڕمانا بە زمانی کۆمیک.

## ژیانی عەلائەدین سەجادی[1]

عەلائەدین کوڕی نەجمەدین کوڕی حیسامەدین لە بنەماڵەی سەجادی، لە ساڵی ١٩٠٧ دا لە گەڕەکی قەتارچیانی شاری سنە چاوی کردەوە بە سەر دونیای رەنگاورەنگی پڕ لە کارەساتدا. بە سوختەیی خوێندنی دەست پێکردووەو بە فەقێتی گەلی شارو دێی کوردەواری گەڕاوەو بنەو بارگەی لە سلێمانی خستووە. لە ساڵی ١٩٣٨ ئیجازەی زانستە ئیسلامییەکان و زمانی عەرەبی وەرگرتووەو دواجار بۆ مەلایەتی و پێشنوێژی لە مزگەوتی نەعیمە خاتوون رووی کردۆتە بەغداو هەر لەوێ ماوەتەوە.

لە ماوەی شەڕی دووەمی جیهانیدا خێی داوەتە رۆژنامەوانی و کۆواری «گەلاوێژ»و «نزار»ی بەڕێوە بردووە. لە ١٩٥٩دا بۆتە مامۆستای زانکۆی بەغدا لە کۆلێژی زمانی کوردیداو تا ساڵی ١٩٧٤ لە سەر ئەم ئیشە ماوەتەوە. لە ١٩٧٠ دەبێتە وەزیری ئەوقاف. لە ١٩٧٧دا خانەنشین دەکرێ.

پاش خانەنشین بوونی هەموو هێزو توانی دەخاتە سەر کار لە سەر بابەتی ئەدەبی کوردی؛ بەڵام کوژرانی کوڕی گەورەی لە شەڕیی ئێران و ئێراق (١٩٨٠- ١٩٨٨)دا وزەی دەبڕێ و پشتی دەشکێنێ. تا لە ساڵی ١٩٨٤دا روو لە شاری خامۆشان دەنێ و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی ئەسپەردە دەکرێ.

### سەجادی رۆژنامەنووس

لە گەڵ نیشتەجێ بوونی سەجادی لە بەغدا، ئیبراهیم ئەحمەد خەریکی دامەزراندنی کۆواری «گەلاوێژ» ئەبێ؛ بەڵام بە هۆی کاری زۆرەوە بەڕێوەبردنی ئەم کۆوارە دەخاتە ئەستۆی سەجادییەوە.

ئەم کاری رۆژنامەوانییە ئەزموونێکی نوێ و گرینگ دەبێ بۆ سەجادی. بە هۆ گەلاوێژەوە سەرچاوەیەکی زۆر لە ئەدەبی کوردی کۆ کردەوەو شارەزاییەکی زۆری لە ئەدەب و وێژەی کوردیدا بە دەست هێنا.

---

[1]- ئەم بەشەم بە هەندێ گۆڕانکارییەوە لە مێژووی ئەدەبی کوردی دکتور خەزندەدار وەرگرتووە.

شوێنی کاری سەجادی ژوورەکەی بوو لە مزگەوتدا. زۆربەی کاتی لە ژوورەکەیدا لە گەڵ کتێب و کاغەزو چاپی گەلاوێژ خەریک بوو. ئەمە بووبە هۆی ئەوەی کە بایەخێکی زۆر بدات بە کاری رۆژنامەوانیو لە سالی ١٩٤٨دا خۆی کۆواری «نزرا» دەربکات. هەرچەند ناوەرۆکی نزار بابەتی سیاسی و کۆمەلایەتی بوو.

### سەجادی پسپۆری ئەدەبی کوردی

سەجادی نووسەرێکی پرکار بووە لە زۆر بواردا؛ بە تایبەت لە بواری ئەدەبی کوردیدا. هەندێ لە کارەکانی سەجادی لە ئەدەبی کوردیدا ئەمانەن:

١- مێژووی ئەدەبی کوردی: گرینگترین بەرهەمی ئەدەبی سەجادییە. هەوەل جار لە ١٩٥٢ و دووەم جار لە ١٩٧٠ لە چاپ دراوە. لەم کتێبەدا سەجادی زانیارییەکی زۆر لە سەر زمانی کوردی لە سەرەتاوە تا سەدەی بیستەم کۆ دەکاتەوە. ئەم بەرهەمە لەو سەردەمەدا رووداوێکی زۆر گەورە بووە لە مێژووی ئەدەبدا.

٢- دەستوور و فەرهەنگی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٦٧.

٣- ئەدەبی کوردی و لێکۆلینەوەی ئەدەبی کوردی، بەغدا، ١٩٦٨.

٤- نرخشناسی، بەغدا، ١٩٧٠.

٥- دوو چامەکەی نالی و سالم، بەغدا، ١٩٧٣.

٦- دەقەکانی ئەدەبی کوردی، بەغدا، ١٩٧٨.

٧- خۆشخوانی، بەغدا، ١٩٧٨.

٨- لە چیرۆکدا سەجادی دەورێکی گرینگ و کاریگەری بووە لە پێشکەوتن و پەرەسەندنی چیرۆکی کوردیدا. نووسە لە نەوەی یەکەمی ئەم هونەرەیە کە لە نێوان دوو جەنگی جیهانی سەدەی بیستەمدا پەیدا بووە. چیرۆکی لەسەر لاپەرەکانی کۆواری گەلاوێژدا (١٩٣٩-١٩٤٩) بلاو کردۆتەوە. پاشان بە ناوی «هەمیشە بەهار» لە بەغدا لە سالی ١٩٦٠دا چاپی کردووە.

ناوئاخنی چیرۆکی سەجادی ژیانی ناو کۆمەلگای کوردەواری و بە دانستە ژیانی لادییە. هەندێ لە چیرۆکەکانی ئەمانەن: «شاییەکەی رەشەی خەجەلاو»، «بۆ نەچووین بۆ کوێستان»، «جەوهەر ئاغا»، «رێویەکەی قەمچۆغە»و ... .

٩- گەشتێک لە کوردستانا(١٩٥٦). گرینگی ئەم بەرهەمە لە باری ئەدەبدا پەخشانە جوانەکانیەو زمانی ئەدەبی یادداشت و تێبینی رۆژانەیانە. ئەم گەشتەی لە کوردستانی عێراقدا و لە شاری بەغداوە بۆ مووسڵ‌و کەرکووک و هەولێرو سلێمانی دەسپێکردووە.
١٠- یەکێک لە گرینگترین کارەکانی سەجادی، «رشتەی مرواری»یە کە لە ساڵی ١٩٥٧وە دەستی پێکردووە و تا ١٩٨٣ درێژەی کێشاوەو لە هەشت بەرگدا بڵاوی کردۆتەوە.

**لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا ئەم بەرهەمانەی هەیە:**

لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بەشدارییەکی شایانی بووە؛ بەرهەمەکانی لەم بوارەدا ئەمانەن:

- شۆڕشەکانی کورد، مێژووی راپەڕینی کور، بەغدا، ١٩٥٩.
- کوردەواری، لە خەڵکناسیدا(ئەتنۆگرافیا)، بەغدا، ١٩٧٤.

لە ئەنجامدا:

عەلائەدینی سەجادی خوێندەوارێکی بە دیمەنی کورد بوو لە سەدەی بیستەمدا. نووسەرو رۆژنامەنووس و کارگەری زانستی بوو. لە زۆربەی مەیدانەکانی ئەدەبی، زانستی، کۆمەڵایەتی‌و مرۆڤایەتیدا بەرهەمی بە نرخی هەیە. باڵادەست بوو لە نووسینی وتارو چیرۆک و یادداشت و بابەتەکانی دیکەی پەخشان. نووسینی بە گشتی زاخاوی مێشک و خۆراکی گیان و ئارامی دڵ و دەروون بوو بۆ خوێنەرو خوێندەوارنی سەردەمی خۆی و لە پاشانا بۆ نەوەکانی دوارۆژ.

**ئەم چاپەی رشتەی مرواری**

لەم چاپەی رشتەی مرواریدا هانمان ئاوە بەرهەمێکی پوخت و رێک و پێک ئاراستی کتێبخانەی کوردی بکەین. لە چاپەکانی‌تردا -بەداخەوە- ئاڵۆزییەکی ئێجگار زۆری تێدا بوو؛ بۆ نموونە هەڵەی چاپی ئێجگار زۆر بوو، لە زۆر شوێندا وشە یا خۆ رستەی لێ داکەوتووە؛ ئێمەش بە پێی بۆچوونی خۆمان ئەو هەڵانەمان راست کردەوەو بۆ ئەوەی خوێنەری هێژا بزانێ کە کاری ئێمە بووە لەم قولاب«[ ]»کەڵکمان گرتووە.

بێجگە لەمەش ئەو کارانەی کە کردوومانە خاڵبەندییە؛ واتە دانانی دوشمانەی کە یاریدەی خوێنەر ئەدا تاکوو باشتر لە مەبەستی نووسەر بگات و کتێبەکەی بەدەوتر بێتە بەرچاو. ئەم نیشانانە ئەمانەن:

. و ، و ؛ و «» و () و [] و "" و // و ! و ؟ و -- و .

هەروەها پاراگرافبەندی؛ کە بریتییە لە دیاری کردنی هەر پاراگرافێک بە مەرجی پاراستنی یەکگرتووی لە یەک لایەنی مەتنەوە.

لەم چاپەدا هانمان داوە بە پێی توان بیۆگرافییەک لە ژیانی ماموستا سەجادی بخەینە پێش چاوی هاوولاتیان، بۆ ئەم مەبەستەش لە «مێژووی ئەدەبی کوردی» دوکتور خەزنەدار کەڵکمان وەرگرتووە.

بە گشتی هیوامان رەزامەندی خوێنەرو پەرایی گەیاندن بە زمان و ئەدەبی نەتەوەکەمانە.

فەخرەدین ئەویهەنگی
سنە، خەرمانانی ۱۳۸٦

*خوێندەواری چرای ژیانە*

**رشتەی مرواری**

کۆمەڵە ئەدەبییێکی هەرە بەنرخە لە فەلسەفەو بیرو باوەڕی کوردی، لە قسەی خۆش و نەستەق و لەو دەماخ چاخکەرانەی کە لە ئاسۆی خەیاڵێکی کوردییەوە گزنگیان داوە.

بیری کوردی قاپی دڵی خۆی کردۆتەوە؛ بۆنی عەبیری، تێکەڵاوی بای شەماڵی ژیری کردووەو وەکوو روناکی بەری بەیان بڵاوی ئەکاتەوە بەسەر دڵی خوێنەرەکانیا.

## سەرەتا

گیتی ئەدەب، گیتیەکی فراوانە. نامەوێ لەمەوە بدوێم ئەگەر یەکێک ویستی بە پوختی لێی تێبگا، تەماشای کتێبی «مێژووی ئەدەبی کوردی» عەلائەدین سەجادی بکا. بەلام ئەوە ئەڵێم کە قەومی کورد، ناموسی تەبیعی هەزاران ساڵە هێشتوویەتەوە. هۆی ئەم مانەوەیە گەلێ شت بووە؛ یەکێک لەوانە تەریکی و گۆشەگیری بووە لە عالەمی بێگانە، ئەم سووچەی زمانەکەی بۆ هێشتۆتەوە. ناتوانی قەومێک ناو بنێی بە قەوم تا زمانی نەبێ. بۆیە بە ئینگلیز وەیا جەرمەن وەیا عەرەب ئەوترێ ئینگلیز، جەرمەن، عەرەب، چونکە زمانیان هەیە. کە زمان نەبوو، قەومیەت نییە. کوردیش تا ئێستە بۆیە ماوەتەوە، چونکە زمانی هەبووە؛ ئەگەر زمانەکەی نەبێ مەفهوومی کورد لە فەرهەنگا نامێنێ.

لەسەرەتای ئەم سەدەی بیستەمەوە، وردە وردە خوێندەواری لەناو رەمەکی کورددا پەرەی سەندووەو ئەستێنێ. ئینکار ناکرێ خوێندەواری چرای ژیانە، بەلام لە لایەکی‌ترەوە من هەست بەزیانێکی گەورە ئەکەم. لەم رووەوە هەست بەوە ئەکەم چونکە خوێندەوارییەکە بەزمانی کوردی نییە [رەنگە][2] هەتا سەدەی بیستەم بەسەر ئەچێ، قەومی کوردیش نەمێنێ. بۆیە ئەڵێم نەمێنێ، چونکە منالەکە لە قوتابخانەی غەیری کوردی لەباتی وشەیەکی کوردی، فێری وشەیەکی غەیری کوردی ئەبێ. ئەو وشەیە دێنێتەوە مالەوەو قسەی پێ ئەکا، برا بچکۆلەکەو خوشکە نەشمیلەکەی لێوە فێر ئەبن. باوکی منالەش ئەڵێ لە کۆرپەلەم فێری زمانی نان پەیدا کردن بووە؛ ئەویش وەری ئەگرێ. دایکەشی ئەڵێ لە دەورت گەڕێم چەند قسەکانت جوانە؛ ئەویش فێری ئەبێ. بەرە بەرە زمانی قوتابخانەی غەیری کوردی منالەکە، شوێن هەوارێکی خۆش بۆ خۆی لەمالی باوکی منالەدا دروست ئەکا و زمانی مادەرزادی کوردییەکە لەژێریا دەست ئەکا بەنقەنق. کە پشتێک بەم جۆرە

---

٢- لە دەقەکاندا لە هەر شوێنێک هەستمان کردبێ وشەیەک داکەوتووە یا نەنووسراوە لێی زیادمان کردووە؛ بۆ ئەوەش کە دیار بێ کاری خۆمانە خستوومانەتە نێو قولابەوە.

ڕۆیشت، پشتی دووهەم و سێهەم ئەڵێن باو و باپیری ئێمە ـ بە ڕەحمەت بن ـ بەزمانێک قسەیان ئەکرد کەپێیان ئەوت زمانی کوردی.

ئەوانەی کە هەست بەقەومیەتی کوردی ئەکەن و هەست بەوە ئەکەن کە «بقە»یەکی گەورە ئابلۆقەی زمانەکەیانی داوە، ئەگەر تەنها ئەم قسەیە بخوێننەوە ئەکەونە سەر ئەو باوەڕە کە زیندوو کردنەوەو بووژاندنەوەی زمانی کوردی لەسەر قاقەز چە کارێکی گەورە ئەکاتە سەر مانەوەی قەومیەتی نەتەوەی کورد.

هیچ ئامانجێکم نییە تەنیا پاراستنی زمانی کوردی نەبێ؛ ئەویش بۆ پاراستنی قەومیەتی کورد لەو تەنگ و چەڵەمانە کە گەمارۆی داون. دنیای ئیمڕۆ وەکوو دنیای دوێنێ نییە. گۆڕانی ئیمڕۆ وەکوو گۆڕانی پێرێ نییە، قەومی کورد ئەبێ کۆشش بکا ـ بەبێ جیاوازی ـ بۆ پاراستنی قەومییەتی خۆی. ئەم کۆششە بەخزمەتکردنی زمانەکەی ئەبێ. زمانی خۆت بپارێزەو بە زمانی خۆت بخوێنەرەوە، ئیتر خەمی هیچت نەبێ.

هیتلەر کە یادداشتەکەی «کفاحی» دانا وتی: «ئەم نوسینەم بەزمانێکە گەورەتر عالمێکی رایەخ چۆنی لێ تێ ئەگا شوانێکی سەر کێویش هەر بەو جۆرە لێی تێ ئەگا؛ بەزمانێکە کە زمانی ئەڵمانییە». منیش هەر ئەوەندە ئەڵێم، ئینجا بابچینە سەر بارێکیتر بۆ من و ئەم کتێبە:

بە بیرەوەری خۆم حەزم بەقسەی خۆش کردووەو لە بیستنی قسەیەکی خۆش وەکو هەستم بە دەنگێکی نهێنی خۆش کردبێ، وابووم. لەبەر ئەوەخۆم لەخۆمەوە هەر ئەگەڕام بەشوێن ئەو قسەو سەرگوزەشتە کوردییانەدا کە لە ناو کورددا باو بوون. بەبێ ئەوە بە شتێکیتر بزانم گەلێکیان لەسنگما مانەوە؛ دیسان هەر تێریشم نە ئەخوارد، ئەمویست زیاتر ببێت. لەپاشا کە ئەمبینی گەلێکیتر وەکوو من حەز بە قسەو سەرگوزەشتەی خۆش ئەکەن و شوێنی ئەکەون، بەلامەوە سەیر بوو کەئەمە بۆچ وایە؟ لەپاش ورد کردنەوە تەماشام کرد ئەمانە [ئەو] مەعانییە روحیانەن کە بە وشە تەعیبریان پێ لێ ئەدرێنەوە؛ ئەمانە ئەو ئەدەبەن کە لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاد تێکەڵاو کراون. ئەو وەختە بۆم ساغ بووەوە کەراستە ئادەمیزاد بە بنەچە پابەندی ئەدەبە؛ چونکە ئەدەب خۆراکی روحەکەیەتی. بۆم ساغ بووەوە کە گەورەیی ئەدەب بناغەی هەموو گەورەییەکە، با هەست بەگەورەییەکانیتریش نەکرێت.

کە چوومە بنج و بناوانی کارەوە دەستم کرد بەخوێندنەوەی شتی تر. تەماشام کرد تەنها قەومی کورد نەبێ، قەومەکانیتر بە هەر دوو دەستەوە چوونەتە ژێر ئەدەبیات. هەر جۆرە شتێکیان بووبێت خێرا لا پەڕەی کتێبەکانیان پێ پڕکردۆتەوەو نەیانهێشتووە ون ببێت.

کە ئەممەم بینی وتم ئایا بۆچی شتی وامان نەبووە لەگەڵ ئەو هەموو قسە خۆشانەدا کە هەمانە؟ لەوە زیاتر هیچم بۆ نەدۆزرایەوە کە رەنگ بێ لەناو ئێمەدا وتەی شوورەیی (عەیبە) نەیهێشتووە هیچ شتێک پێکەوە بنێن. دیارە هەرواش بووە، چونکە زۆرتر ئەو قسەو سەرگوزەشتە خۆشانە تا ئێستە هەروا بە رشخەنێکەوە گێڕاونەتەوەو لەوانە بوون هەر لەگەڵ یەکێک، یەکێکیانی لێ گێڕا بێتەوە خێرا لێی هاتبێتنە سەر پێ و «عەیب نیە تۆ ئەم قسە ناشیرینە ئەگێڕیتەوە؟» لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قسەیە کە ناشیرین وەیا پێچەوانەی ئەدەب و شەرم دائەنرێ، ئەوە جەوهەری ئەدەب و ئەقڵەو ئەدەب لەوە دروست ئەبێ.

ئەدەب پەردەی ژیانی کۆمەڵە کە شان بە شانی هاتۆتە خوارەوە؛ ژیری و زەینی پێشان ئەدا، رابواردن و هەڵسوکەوتیان ئەخاتەروو. ئەو پارچە قسانە وەکو لە رواڵەتا ساویلکەن، لەمەعنادا زۆر شت ئەگەیەنن. ئاسمانی مەعنایان گەلێ بەرزترە لەو ئاسمانە کە تیایانا دەر ئەکەون.

قەومەکانی‌تر هەموو شتێکیان وتووەو نوسیویانەتەوە، ئیتر چاک بووبێتن یا خراپ نەیانهێشتووە سەریان تیا بچێ. منیش لەبەر ئەمانە هاتم لەم سەرگوزەشت و پەندانە بە ئەندازەی دەسەلات، وەبگرە زیاد[تر لە] دەسەلاتیشم لێ کۆ کردنەوەو حەزم کرد لەم رەوشەوە کتێبێکمان ببێت.

ئەزانم سەرەتا لەوانەیە زۆر کەس لێ بکەویتە تەقەوەو بڵێ: قسەکان بێ شەرمی و پێچەوانەی ئەدەبی دیوەخانانە؛ نەئەبوایە شتی وا بنووسرایە. منیش هەقیان ئەدەمێ؛ چونکە هەموو شتێک لەسەرەتاوە لەبەر ئەوە تازە کورەیە، بەرهەڵستی بۆ پەیدا ئەبێ؛ بەلام لەپاش ماوەیەک ئیمان بەوە دێنن کە سووچێک لە ئەدەبی ون بووی کوردی زیندوو بۆتەوەو دارمێخەکی سیسی ئاو لێ براو گەشێنراوەتەوە. ئەمەو دیسان ئەڵێ:

کابرایەک نوێژی نیوەڕۆی ئەکرد وتی: «نیەتمە هەشت رکات نوێژی ئەم نیوەڕۆیە ئەکەم». کە لێ بووەوە مەلا پێی وت باوکم نوێژی نیوەڕۆ چوار رکاتە، کەی هەشت رکاتە؟ نوێژەکەت بکەرەوە. ئەویش پێی وت: «مامۆستا، من هەشت رکاتم کردوە، خوا تێکەوێ چواری چاکی بۆخۆی هەڵبژێرێ و چوارەکەی‌تری بداتەوە بەسەر خۆما». ئێستەش ئەم کتێبە هەرکەس ئەیخوێنێتەوە ئەوەی چاکە بۆ خۆی هەڵبژێری و ئەوی خراپە بیداتەوە بەسەرخۆما. دیسان ئەیلێمەوە: کاکی کوردی خۆشەویست! تووڕە مەبە بۆ نوسینەوەی ئەم کتێبە؛ میللەت وەکو باخی پادشاهانە، گوڵی چاکیشی تێدایەو هی خراپیش. لەگەورەتر کتێبی ئەدەبیاتی عالەمی عەرەبی «اغانی ابو فرجی الفهانی»و «عقدالفریدی ابن عبد

ربە»یە، ئەم کتێبانە عالەمی ئیسلامی و غەیری ئیسلامی دانیان پیائەنێن کە شا کتێبی ئەدەبن، ئەمە بێجگە لە «المستطرف فی کل فن مستظرف»ی شەهابەدینی ئەحمەدی ئەبشەهی، ئەگەر بەپوختی چاوێک بەوانەدا بخشێنی بۆت دەرئەکەوێ ئەوانەی من لەم کتێبەدا نوسیومن شوورەییەکەیان نەگەیشتۆتە شوورەیی هەندێ لەوانەی کە لەوانا نوسراون. ئەم قسانەی ئێرە وەکوو شوێنانی‌تر هەر یەکە دەورێک ئەگێرنەوە: هەم ئەدەبە؛ کە ئەدەب پەردەی ژێری تاک و کۆمەڵ ئەگێڕێتەوە. هەم بۆنێکە بۆ دەماخ کە بۆنی دەماخ لەززەتی رۆحییە.

عەلائەدین سەجادی
١٩٥٢/٣/٢٤

## سەرنجێک

ئەبێ ئێمە ئەوە بزانین کە لەناو کوردا «مەلا» دەستەیەکی دیاری و ئاشکرا بوون؛ بەرەی خوێندەوارو زانیار هەر ئەوان بوون. لە هەموو وەختێکا و لە هەموو شوێنێکا بەپەنجە، پەنجەیان بۆ راکێشراون. ئەم دەستەیە لەناو مەردما تا ئەو پەڕی، بەچاوی گەورەیی و ریز لێ گیراوییەوە تەماشا کراون. لە ئیشی بچووک و زلدا پرس بەوان کراوەو ئەوان بڕیویانەتەوە.

تەنانەت ناوی «مەلا» بە جۆرێک بەرز بوەتەوە ناوی هیچ چینێکی‌تر نەبووە بەرانبەری بەناوی ئەوان بکا. لەبەر ئەمە ناوی ئەمان لەسەر زمانی گەورەو بچوک بووە. فەرمانێ کەئەمان دابێتیان گێڕانەوەی نەبووە. جا بەم بۆنەوە هەچ کارو فرمانێک بووبێت دراوەتە پاڵ ئەوان و وتوویانە «مەلا وای وتوە» یا «مەلا وتی». [وتنی] ئەم ناوە لەسەر زمانی خەڵک، هەمووی نیشانەی خۆشەویستی و گەورەیی ئەوان بووە. وەکوو چۆن لە ماڵێکا خێزان و ماڵ و منالی ئەو ماڵە هەر کامێکیان هەستن و هەر قسەیەک بکەن بۆ ئەوە کە ئەو ئیشە ئیتر کێشەی تێدا نەبێ هەر ئەڵێن «باوکم وای وت» یا «باوکم وتی» دیارە ئەم رستە نیشانەو بەڵگەیە بۆ گەورەیی باوکەکە لەبەر چاوی خێزانەکەوە. وتنی ناوی «مەلا»یش لەبەر چاوی تێکڕای مەردمەکەوە ئەم سەمەرەیە بووە، بۆیە لەزۆر شوێنی سەرگوزەشت و قسەی کوردیدا وشەی «مەلا» پاڵەوانی سەر گوزەشتەکەیە.

## قسەی نەستەق

خەڵکی! مستەفای میروەیس ریش سپیەکی هۆزی شاتری بوو لەعەشرەتی جاف. قسەکانی هەموو دانسقەبوون. ئەمە یەکێکە لەو قسە بە نرخانەی کە ئەڵێ: «قسە بیگێڕە، بیپێژە، بیوێژە».

– هەمەوەن دابوویان بەسەر خێڵێکی جافدا هیچیان بۆ نەهێشتبوون. پیاوێکی خێڵەکە لە چنگیان دەرباز بووبوو، لەسەر حەوزەکەی مزگەوتی مەلا حسینی پیسکەندی لە سولەیمانی دەم و چاوی ئەشوا. ئەم کارەساتەش بڵاو ببووەوە بە سولەیمانیدا. لەو کاتە مەلا حسین لەکابرا ئەپرسێ: هابرا! چی هەیە؟چی نییە؟ کابرای جافەش ئەڵێ: «برا چی ببی ؟ پیاو بوو کوژیا، ماڵ بوو بریا، دێ بوو سوتیا، ئیتر چی ما؟»

من قسەی ئەم پیاوە جافەم گەلێ لەقسەی ئەو پیاوە بوخاراییە پێ جوانترە کە لە ٦١٦ی هیجریدا چەنگیزخانی مەغولی شاری بوخارای سووتاندو خەڵکەکەشی کوشت؛ ئەم هەڵهات. لەرێگەدا باس و خواسیان لێ پرسی وتی: «امدندو کندندو سوختندو کشتندو بردند».

– «عەزیری مەسرەف» لەدیوەخانی شای ئێران ناسرەدین شادا ئەبێت. شا ئەپرسێ: ئاغا! زووتر ئەسپی چاکت هەبوون چیان لێ هات. ئەویش ئەڵێ: «شاهم، خاوەنی خۆیان سواریان بوون و رۆیشتن». شا ئەم وەڵامەی پێ خۆش ئەبێ.

– جارێک مەولەوی لەشاری سنە لە کۆرێکا دائەنیشێ. لێی ئەپرسن ئەڵێن: تۆ هەر ئەڵێی هۆزەکەم خۆشیان ئەوێم، بەگەورەم دائەنێن؛ بەچیا پێشانی ئەدەی کەراست ئەکەی؟ ئەویش ئەڵێ: خۆ ئەگەر هیچ نەگێڕمەوە ئەوە بۆمن بەسە کە هەورامیەک بارێکی ئێجگار گران لە کەرەکەی ئەنێ و ئەیەوێ بەسەر کێوی «ئارێز»دا سەری خا و کەرە مان ئەکاو نارِوا. پێی ئەڵێ: «هەچە دەی هەچە! بەخوا ئەگەر مەولەویش بیت هەر سەرت ئەخەم».

- خانزادەخانی هەریری وتوویە «لەدەوری ئەو پیاوە ئەگەڕێم کە بەنەخۆنەکەی درێژەو بەنی کالەکەی کورت».

- مەحمودیﻧادریشاتری هەبوو، منالی نەئەبوو. لە دەمەدەمی پیریدا ژنێکیتری هێنابوو، دوو کوڕی بووبوو. لێیان پرسی: خالە مەحموو منالت هەیە؟ وتی: «بەڵێ دوو کوڕم هەیە؛ بەڵام داخی گرانم دایکیان ئەگێن، لەوانە نین دایکی منالی خەڵکی بگێن». مەبەستی ئەوەبوو من پیرم، ئەمرم و دایکیان مێرد ئەکاتەوە.

- پاشاکۆرەیرواندز لەجەنگدا بوو، فەرمانی دابوو کەس چرا نەسووتێنێ. شەوێک خۆی گۆڕیبوو، بۆ تاقی کردنەوە بەناو شارا ئەسوڕایەوە. سەیری کرد وا لە دوورەوە لە بنەبەردێکا سووسەی ڕووناکیەک دێت. کە چوو تەماشای کرد ئەوا مۆمێک ئەسوتێ و ژن و پیاوێک لەبەریەوە دانیشتوون گەمەو گاڵتەئەکەن. پیاوەکەی بانگ کرد، پێ وت:

ئایا ئەمناسی؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەی گوێت لەو فەرمانە نەبووە کە وتوومە یاساغە بەشەو چرا داگیرسان؟ وتی: «بەڵێ گوێم لێ بووە، بەڵام ئەمە چوار ساڵە لەگەڵ ئەم کچەدا دڵمان پێکەوەیە تا ئێستە بۆمان ڕێ نەکەوتووە پێکەوە دانیشین. ئیمشەو بۆمان ڕێ کەوتووە وا پێکەوە دانیشتوین. ئێستەش پاشا سوورە کە هەستا، نەگوێی بەپاشا کۆرە ئەدا نە بە پاشای ساغە». پاشا کۆرە کە ئەمەی بیست دەست ئەکا بە پێکەنین و ئەڵێ: «بڕۆ هەموو شەو هەر لەخۆشیدا بن».

- مەلافەتاحیخەتێ لەدیوە خانی پاشا کۆرەی رواندز ئەبێ. کابرایەک دێت ئەڵێ: پاشا، یەکێ لەپیاوەکانی تۆ گایەکەم هەبوو لێی زەوت کردم. مەلاش ئەڵێ: «برا ئەگەر پاشا مەزرەعەی ڕۆژی دوایی خۆی بە گای هەژارێکی وەکوو تۆ نەکێڵێ چی بکا؟» پاشا ئیتر فەرمان ئەدا گاکەی پێ ئەدەنەوە.

- مەلارەسولیتەلانی هەبوو لەسولەیمانی ئەمناسی. کوتوپڕ نەخۆش کەوت. سەرەتا بۆم ڕێ نەکەوت بچمە لای، بە ئیمڕۆژ و سبەی دوام خست. لەپاشا کەوتمە تەقەوە هەر نەچووم. مەلا ڕەسوڵ لە نەخۆشیەکەی چاک بوەوەو هەستایەوە. ڕۆژێ چاوی پێم کەوتو

گلەیی لێ کردم کە لە نەخۆشیەکەیدا نەچووم بۆ لای. منیش زۆر شەرمەزار بووم، هیچم پێ نەما، وتم: «مەلا رەسوڵ خوا رووی مردن رەشکا وا منی شەرمەزاری لای تۆ کرد».

- بۆ بەغدا ئەهاتم، کە گەیشتمە جێ مەلامەحمودیوەتراخچی وەلامی بۆ ناردم وتی: «بەو ناو و نیشانەی کە رۆیشت و چاومان پێنەکەوت، سەلامی لێ ئەکەم». منیش وەلامم بۆ ناردەوە وتم: «بەو ناو و نیشانە کە هاتم و چاوم پێنەکەوت، سەلامی لێ ئەکەم».

- ژنێکی مەنمی کوڕێک و برایەک و مێردێکی ئەبێ؛ هەر سێکیان لە لایەن حکوومەت ئێرانەوە ئەگیرێن و فەرمانی خنکاندنیان ئەدرێ. ژنەکە لەبەر «دارقەواخ»ەکەدا کە بۆ ئەوانە هەڵخرابوو ئەوەستێت و بێ هۆش ئەکەوێ. حاکم ئەنێرێ ئەیهێنن، ئەڵێ: ژنەکە یەکێ لەم سێ کەسەت پێ ئەبەخشم، جا بۆ خۆت یەکێکیان هەڵبژێرە. ژنە خێرا ئەڵێ «براکەم».

حاکم ئەڵێ بۆچ براکەتت هەڵبژارد؟ کوڕ بەو خۆشەویستیە و مێرد بەو نازداریە گوێت نەدانێ؟ ئەویش ئەڵێ: «جەنابی حاکم، سبەینێ ئەچم مێردێکیتر ئەکەم، ئەوە مێردەکەم. کوڕێکیشم ئەبێ ئەوەش کوڕەکەم؛ بەڵام تازە باوک و دایکم زیندوو نابنەوە برایەکیترم بۆبێنن». حاکم کەگوێی لەم وەڵامە ئەبێ، هەرسێکیانی پێ ئەبەخشێ.

- لەکابریەکی کوردیان پرسی بە چیدا ئەزانی خوا یەکێکەو دوو نیە؟ ئەویش وتی: «بەئاشەکەی ماڵی لالەما؛ تا ئەو وەختە کە هەر خۆی بوو دایمەگەڕ بوو، ئێستە کە لەگەڵ حەمەی شەفێ بوون بە شەریک، رۆژێک ئەگەڕێ و چوار رۆژ ئەوەستێ. خواش ئەگەر یەکێکی کەی لەگەڵ بوایە ئیشەکەی وەکو ئاشەکەی لالەمی لێ ئەهات».

- کابرایەکی موکری لەگەڵ ژنەکەیا دانیشتبون لەگوێ ئاگردانەکەیانا، کلووی بەفر ئەهاتە خوارەوە. دوو چیلکەیان کردبووەوە بەئاگرو کزولەیان کردبوو لەبەریا. ژنەکە لەپیاوەکەی پرسی: «ئەرێ پیاوەکە! ئیمەباش رائەبوێرین یا عەزیزخانی سەردار؟» پیاوەکەش پێی وت: «ژنەکە، عەزیزخان چاک ئەخوا، بەلام ئیمە چاک ئەکەین». وەلامەکەی دوو سووچی هەیە.

- قازیخدروەیسلەئالیبەگی، پیاوێکی دانا بووە، لێی ئەپرسن: «شاسوار کوڕی تۆیە؟» ئەویش ئەڵێ: «من باوکی ئەوم».

- سمایلیحەمەجان هەندێ تووتنی هەبوو مەجیدی خوشکەزای لێی دزیبوو. سمایل چوو سۆراخی توتنەکەی لە مەجید پرسی، مەجیدیش وتی: «خاڵە، تووتن دزیاگ و خاوەن تووتن و تووتن بریاگ یا خوا بەکۆی زوخاڵ بێ؛ دزیش بەرێ خوێ». سمایلیش وتی: «توخوا برا سوێن مەخۆ، ئیتر دڵم بوو بە ئاوێنە».

- بەگێک تلیاکی ئەکێشا. رۆژێ دابووی لەسەری، رووی کردە حەمەرەحیمی پیاوی وتی: «حەمەرەحیم ئێستە ئەگەر هەزار لیرەم ببوایە، پێنجسەد لیرەم ئەدا پەنجا ئەسپ و تفەنگ و پەنجا پیاوم سوار ئەکرد و ئەم خستنە پشت سەری خۆم، ئەچوین بۆتاران بایی پێنج سەد لیرەکەیتری تلیاکمان ئەکڕی و ئەهاتینەوە». حەمەرەحیمیش وتی: «وەڵڵا میرم ئەگەر مژێکیتر لە بافوورەکە بدەی هیچ سواریشت ناوێ، هەر خۆت ئەچی ئەیکڕی و دییتەوە».

- کابرایک بوو بە میوانی ماڵە کوردێک. نانیان دانا، چێشتەکە زۆر گەرم بوو. کابرای میوان هەموو دەموودانی سووتا. لەتاوانا سەری بەرز کردەوەو سەیرێکی دارەڕای خانوەکەی کرد، بۆ ئەوەی خاوەن ماڵەکە هەستی پێ نەکا، پێی وت: «ئەرێ برا ئەم خانوەت بەچەندی دروست کردوە؟» کابرای خاوەن ماڵیش وتی: «بە دوو فوو و سەبرێک»

-لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٠ دا مزاحمئەمینپاچەچی نائب رەئیس وزەرای عێراق بوو. من عەمرم ٣٥ ساڵێک ئەبوو، زیاتر لەدوو بەشی مووی سەرم سپی بووبوو. بەچەند ساڵێکی کەم لەپێش ئەم تاریخەدا چاوی پێم کەوتبوو. لەم تاریخەشا دیسان لەشوێنێک یەکمان گرت. عادەتیشی وابوو بە دانەدانە قسەی ئەکرد. پێی وتم: «ماکنت اتامل ان اری راسک هکرا عاجلا». منیش کوتوپڕ پێم وت: «افردنی الدهر والمتنی الملائب فاشتعل الراس شیبا».

- لەشار قوریان ئەپێوا. کابرایەکی کورد بەوێدا تێپەڕی پرسی ئەوەچیە؟ وتیان «شامردووە» وتی: «ئۆ! خۆزگەت پێ نەوێ ئەو "مێ" ئەمرێ، ئێستەئێژی شامردگە». «مێ» مەڕە.

-ئەحمەدبەگی‌فتاح‌بەگی‌ئەرازی پیاوێکی بۆشناخ و بەدەمار بوو. بەپێچەوانەی ئەو فتاح بەگی باوکی پیاوێکی ساویلکەو بێ دەمار بوو.

ڕۆژێک ئەحمەدبەگ ئەڵێ: «بابە، ئاخر تۆ بۆچی وا لەگەڵ هەموو کەسێکا هەڵسوکەوت ئەکەیت و خۆت ئەکەی بە هاوشانی هەموو کەس؟ ئاخر تۆ نازانی من کوڕی تۆم؟» باوکیشی ئەڵێ: «ڕۆڵە، من ئەزانم تۆ کوڕی منی، بەلام تۆ نازانی کە من باوکی تۆم».

- ڕەسووئاغای‌مەنگوڕ هەموو ئیشێکی خراپەی ئەکرد، جارجاریش ئەچوو نوێژێکی ئەکرد. پێیان ئەوت ئاغا ئەوە ئەو نوێژە بۆچ ئەکەی؟ ئەی وت: «کوڕە نەوەک ئەم مەلایانە ڕاست بکەن کە ئەڵێن ڕۆژی قیامەت هەیە، با ئەمەشم بەدەستەوە بێت».

- بە مەلاقادری‌بیارەیان ئەوت «مەلای گەورە» و بەکتێبخانەکەشیان ئەوت «کتێبخانەی مەلای گەورە». ئەم قسەیە لەناو خەڵکا بلاو بوبوەوە. ڕۆژێک دوو کورد بە تامەزرۆیی ئەچن مەلای گەورە ببینن بزانن ئەمە بە ئەندازەی چەند کەس ئەبێ وا هەموو کەس پێی ئەڵێ مەلای گەورە. بەم نیازە چوونە «بیارە»و چوونە ناو خانەقاوە. کە چوون هەر چاوەچاویان بوو بۆ ئەوە زەلامێکیان بەئەندازەی فیلێک بەرچاو بکەوێ. هەر بەر چاویان نە ئەکوت لەگەڵ ئەوەشا «مەلا قادر» دوو سێ جار بە بەر چاویانا تێپەڕی بوو، بەلام هیچی لەخەڵکی‌تر زیاتر نەبوو؛ گوێیان نەدابوو و نەیانناسیبوو. لەئاخرا ئەپرسن «ئەرێ برا مەلای گەورەکامەسە؟» ئینجا یەکێک مەلای گەورەیان پیشان ئەدا کەئەچن و سەیری ئەکەن واقیان وڕ ئەمێنێ، ئەڵێن: «ئەرێ کوچکت لێ نەوارێ خۆ ئەمە هەر وەکوو ئیمە واسە. ئەی بۆچی ئێژن مەلای گەورە، مەلای گەورە؟» لەپاشا ئەڵێن دەبا بچین کتێبخانەکە ببینین بزانین ئەو چۆنە؟ ئەچن و کتێبخانەیەکی زۆر گەورەیان بەرچاو ئەکەوێ و کتێبێکی ئێجگار زۆری تێدا ئەبێ. هەروا سەیری ئەکەن، ئینجا یەکێکیان ڕوو ئەکاتە

ئەوی کەیان و ئەلێ: «لفتە، ئەزانی ئەم کتێوانە گشتی ئێژن چی؟» ئەویش ئەلێ: «ئێژن چی؟» گشتی ئێژن خاس بکەو خراو مەکە. دەبێوەڕیوە، بێوەڕیوە ئیتر».

- شەویک لە نیوەشەوا کابرایەک بە کۆلانێکا ئەڕواتەوە بۆ مالی خۆی، تەماشا ئەکا زەلامێک دیواری مالێک ئەکەنێتەوە. کابرا ئەپرسێ کوڕە، کابرای کوردە ئەوەچی ئەکەی؟ ئەویش ئەلێ: «دەهۆل لێ ئەدەم». ئەلێ: ئەی بۆچ دەنگی نایە؟ ئەویش ئەلێ: «بەیانی گوێت لەدەنگی ئەبێ».

-لەشەڕی ١٣٣٦ی هیجری کە شەڕی رووس و تورک کرا چەند کەسێ لە عولەما بۆ ئەوە خەلک بنێرن بۆ شەڕ، چوو بوون بۆ ناو عەشیرەتی «مەنگوڕو مامەش». لە دیواخانی حەماغای مامەش، رەئیسی عەشیرەتەکان وەکوو هەمزەئاغای مەنگوڕو حەمەمین ئاغای بلباس و هی‌تریش کۆ ئەبنەوە. یەکێ لە مەلاکان وەعزیان بۆ ئەخوێنێ ئەلێ: ئەمە غەزایەو پێویستە لە سەر موسولمان بیکا. هەر کەس بچێ ئەگەر بکوژرێ شەهیدە، پایەی شەهادەت زۆر گەورەیە؛ خۆ ئەگەر نەشکوژرێ ئەبێ بە غازی، پایەی غازیش دیسان زۆر گەورەیە. کە مەلا لێ ئەبێتەوە کوێخایەکی بلباس هەلئەستێ و ئەلێ: «ماموستا، ئەگەر خوا ئارەزوو بکا هەرچی رووس هەیە بە سەعاتێک ناتوانێ بیانکوژی؟» مەلا ئەلێ: بەلێ ئەتوانێ. کوێخا ئەلێ: ئینجا خوا کە خۆی پێی ئەکرێ بۆچی خۆی هەموویان ناکوژێ و بۆچ فتنەکە بە ئێمە ئەگێڕێ؟»

- خدری میروەیس کابرایەکی جاف بوو. یەکێک لە قسە جوانەکانی ئەوەیە ئەیوت: «لە پەرچ ئەوبەر لەقوڕ ئەو دەر»؛ واتە لە ناو بێشەلانا لەپێشەوە بە لەناو قوڕا لەدواوە.

-سالێک بوومەلەرزەیەک لە پێنجوێندا کەوت، کابرایەکی ترسنۆک بە پیاوێکی گەورەی وت: «رەنگە لە بوومەلەرزەکە زۆر ترسابێتی و لەرزیبێتی». کابرا وتی: «بەلێ، بەلام زەویەکە لە منیش و لە تۆیش زیاتر ترسا و لەرزا».

- رۆژێک سوالکەرێک چوە مالێک، ژنی مالەکە هیچی پێ نەبوو بیداتێ. مێردەکەی تازە کەوایەکی گول سورمەیی بۆ کڕیبوو، کەواکەی داکەند و دای بەسوالکەرەکە. دوو جار

ئاخی هەڵکێشا و وتی: «زۆرم بەزەیی بە هەژاردا دێتەوە. نازانم ئەمانە بۆچ ئەبن بەسواڵکەر؟» هەژارەکەش وتی: «خانم، منیش وەختێ دەوڵەمەند بووم، هەر چیم هەبوو وەکو تۆ دام بە سواڵکەر هەتا گەیشتم بەم رۆژە».

– رۆژێک کابرایەکی کورد لە هەیوان دانیشتبوو گۆشتە مریشکی سورەوە کراو و هێلکەی کولاوو کولێرە بەرۆنی ئەخوارد. کابریەکی سواڵکەر لەو وەختەدا هاتە حەوشە بانگی کرد: «برسیمە ئەوە چی ئەخۆن لەرێی خوادا بەشم بدەن». کابرای خاوەن ماڵ گورج رانێکی مریشک و هێلکەیەک و کولێرەیەکی دایە دەست ژنەکەی وتی بۆی بەرە. ژنەکە بۆی برد و دایە و گەڕایەوە. کە مێردەکەی تەماشای ژنەکەی کرد ئەوا فرمێسک بەچاویا دێتە خوارەوەو ئەڵێ: «یا رەبی الحمدالله».

کابرا پرسی: کچێ بۆچی ئەگری؟ وتی بە خوا ئەو سواڵکەرە وەختی خۆی مێردی من بوو؛ زۆر دەوڵەمەند بوو. ئێستا کە دیم سواڵ ئەکا بەزەییم پیا هاتەوەو هەقی بە سەرمەوەیە بۆیە ئەگریم. لێی پرسی ئەوە بۆچی «الحمدللە»ت کرد؟ وتی ئەمەش حەکایەتێکی لە سەرە. کابرا وتی تۆ خوا ئەگەر پێم نەڵێی؟

ژنەکە وتی: «مێردەکە جارێک ئەم سواڵکەرە کە مێردم بوو وەکو ئەمڕۆی تۆ دانیشتبوو نانی ئەخوارد. سواڵکەرێ هات هاواری کرد برسیمە، ئەوە چی ئەخۆی بەشم بدە. مێردەکەم نەیدایە. فەقیرەکەش نەڕۆیشت هەر داوای ئەکرد. ئاخری هەڵسا پەلێکی فەقیرەکەی گرت بە پاڵەستۆ کردیە دەرەوە و درگای داخست و هاتەوە دەستی کرد بەنان خواردن. فەقیرەکە بەرا کردن چوە سەر بانەکەو بازی دایە خوارەوەو دیسان هاواری کرد چی ئەخۆی بەشم بدە زۆرم برسیە. منیش تکام لێکرد خێرت ئەگا بەشی بدە. کابرا وەکو هیچی نەدایە دارێکی هەڵگرت سێ داریشی لێ دا و دووبارە کردیەوە دەرەوە. ئێنجا منیش ئەوەی ئەو رۆژەی ئەوم بیر کەوتەوە لە گەڵ ئەمەی ئێستەی تۆدا کەوا تۆ ئەوەندە دڵت چاکەو بەشی ئەوت دا. شوکر لە سەر ئەوە ئەکەم کە تۆ ئەوەندە رژد نیت.

کابرای مێردی وتی: ئەم سواڵکەرە فلانی کوڕی فلانە کە ماڵی لە فلانە جێ بوو؟ وتی: بەڵێ. وتی: «دەسا ژنەکە ئەو سواڵکەرە کە تۆ گێڕاتەوە من بووم کە هاتم پاڕامەوە هیچی نەدامێ و دەری کردم و لە بەر برسێتی چوومە سەر بان خۆم خستە خوارەوە دیسان هیچی نەدامێ و سێ داریشی لێدام».

- کابرایەکی کورد ژنێکی هێنا ناوی «لەیلا» بوو. ڕۆژێک شەڕی لەگەڵ مێردەکەی کرد. مێردە دەنگی نەکرد. ڕۆژێکی‌تر هەندێ شتومەکی شکاند هەر دەنگی نەکرد. جارێکیکە دیسان کاسەو کەوچکەکانی بەم لاو بەولادا بلاو کردەوەو فڕیی دان. کابرا ئیتر پێی هەڵنەگیرا گەلێ جنێوی دایێ.
ژنەکە وتی: «پیاوەکە لە بیرت دێ کە تازە هێنابووتم بانگت ئەکرد لەیلا لە خۆشیانا گەزگەز بالات ئەکرد؛ کەچی ئیستاکە جنێوم پێ ئەدەی؟» کابرا وتی: «ژنەکە ئیستاکە تێگەیشتووم کە ئەوسا چەندە شێت بووم».

- کابرایەکی کورد میوانی ماڵێک بوو، شەو لە دوای نان خواردن بە خانە خوێکەی وت دەمم تاڵە ئەگەر هەیە شیرینییەکم بۆ پەیدا کە. خانە خۆێکە وتی: خورمامان هەیەو مێوژیشمان هەیە، کامیان ئارزوو ئەکەی بۆت بێنم؟ کابراش وتی: «خورمژ».

- شێخ‌ڕەزا و وەسمان‌پاشای‌جاف ئەکەونە شەڕە شیعر. شێخ‌ڕەزا بە شیعر دەست ئەکا بە قسە وتن بە وەسمان پاشا. وەسمان پاشاش ئەڵی: «شێخ ڕەزا، شێخ‌ڕەزا من شیعرو میعر نازانم وە کوردی هەر دوو گونم وەقنگت».
- کابرا یەکی لەیلاخی تووشی کابرایەکی گەلباخی بوو لیێ پرسی: «برا ناوت چەس؟» وتی «یوسف». ئەمیش پێی وت: «برای عازیز یولفس فرە خاسی شوکر، تو خوا برا ناو باوکت چەس؟» ئەویش پێی وت: «وە ریش باوکتەوە ناوخومت خاس زانی، جا نۆرەی ناو باوکمە».

- دوو پیاوی دەوڵەمەند لەسەر ملکێکی بەنرخ کێشەیان ئەکەوێتە بەینەوە، ئەچنە لای مەلایەک بۆ شەرع کردن. یەکێکیان دوو مەن ڕۆن بۆ مەلا ئەباو ئەڵێ: ماموستا تۆزێ ئاگادار بە. لەدوای ئەو پیاوەکەی‌تریان ئێستریک ئەبا هەر بۆ مەلا، ئەڵێ: ماموستا تۆزێ وریابە. سبەینێ کە ئەکەونە شەرعەوە، کابرای خاوەن ڕۆن سەیر ئەکا مەلا شەرعی بەلای ئەویتر دا. لە دڵی خۆیا ئەڵێ نەوەک مەلا لێ گۆڕابێ وابزانێ ئەو کابرایە ڕۆنی بۆ بردووە، ئەڵێ: «ماموستا، ئەوە داوێنی کەواکەت ڕۆنی پیاڕژاوە؟» مەلایش سەیرێکی داوێنی ئەکاو ئەڵێ: «نە؛ ئێستر پێی پیا ناوە».

- پیرێژنێکی کورد هەبوو لە ژوورەکەی خۆیا لەبەر قاپیەکە خەریک بوو دووخی ئەڕست. وردە وردە بەدەمیەوە لەنگەریەک قاوتیشی لە تەنیشت خۆیەوە دانا بوو بە لوێچ ئەیکرد بەدەمیا، بەلام بای ئەهات نەیئەهێشت تۆزێ لێی بچێتە دەمیەوە. کابرایەک بەویدا تێپەڕی، لێی پرسی پوورە فەرخی ئەوە چی ئەخۆی؟ وتی: «بەخوا برام تا ئەم بایە لەم کونەوە بێت هیچ».

- جارێک سەیدئەحمەدی‌خانەقا لە مەلای کۆیە ئەپرسێ: «مامۆستا دەغل و دانی لای ئێوە چۆنە؟» مەلاش ئەڵێ: «جەنابی سەید، دەغل لای ئێمە هەیەو دان لای ئێوە».

- شێخ بابەعەلی‌تەکیەیی لەبەر هەیوانی مزگەوتەکەی خۆیا دائەنیشێ، فەقێیەکی خەڵکی ئەو کێوە لەوێ ئەخوێنێ. فەقێ ئەچێ بۆ دەستنوێژ. بە بەردەمی شێخا ئەڕوا ئەڵێ: سەلام عەلەیکم. ئەگەڕێتەوە ئەڵێ: سەلام عەلەیکم. خێرا خێرا بۆ لایەک ئەچێ و ئەگەڕێتەوە بەسەلام عەلەیکم. بابەعەلی وەڕەس ئەکا؛ ئیتر ئەگاتە جەرگی. جارێکیان هەڵئەستێتە سەر ئەژنۆو لیێ زیت ئەبێتەوە ئەڵێ: «ئەرێ برا! هیچ وەکوو بزانی من سەلاملغی تۆم لێرە دانیشتووم. بۆ وازم لێ نایەنی؟»

- کابرایەکی کورد کوڕێکی هەبوو بە زووخاوی جەرگ و بە هەزار کوێرەوەری کوڕەکەی گەورە کرد. لەپاشا کوڕە لەگەڵ باوکەکەیا چاک دەرنەچوو، جا باوکەکەی ئەیوت: «تا منال بوو لێم باربوو؛ کە گەورە بوو لێم هاربوو».

- مەلایەک وەعزی ئەدا، لە وەعزەکەدا ئەیوت ئەگەر پیاو ئەوە بکا ئەچێتە بەهەشت و ئەوە بکا ئەچێتە جەحەنەم. یەکە یەکە هەموو چاکەو خراپەیەکی هەڵئەدا و زۆر پێوە خەریک بوو. دوو کابرای کورد لە وەعزەکەدا بوون یەکێکیان بەوەکەیانی وت: «بێوەڕێوە، بێوەڕێوە. ئەم درێژ دەریەی نەگەرەکە، ئەگەر خاس بکەی ئەچیتە بەحەشت و ئەگەر خراو بکەی ئەچیتە جەحەنەم».

- کابرایەک هەبوو گۆزەیەکی دانا بوو هەر کەسێک کە ئەمرد بەردیکی ئەخستە گۆزەکەوە، لە ئاخری ساڵا ئەیبژارد بزانێ ئەو ساڵە چەن کەس مردووە. دۆستێکی هەبوو

رۆژێک هات بۆ لای، سەیری کرد کابرا دیار نییە، لە دراوسێی دوکانەکەی پرسێ: ئەرێ فلان کەس چی لێ هات؟ ئەویش وتی: «چوەگۆزەکەوە».

- کابرایەکی دەباخچی کوڕێکی هەبوو هەموو جار پێستەی ئەدایە بیباتە سەر کارێزی «دایکی پاشا» بیشواتەوە. کە پێستەکەی ئەدایە چینێکیشی لێ ئەداو پێی ئەوت: پێستەکە نەدەی بە دەم سەگەوە. خەڵکی پێیان ئەوت خۆ هێشتا نەیداوە بە دەم سەگەوە بۆچی لێی ئەدەی؟ ئەیوت: «جا کە دای بەدەم سەگەوە ئیتر لێدان بەکەڵکی چی دێ؟»

- کابرایەکی کورد ژنیان بۆ هێنا، برازاواکان هەر پێیان ئەوت برا خۆت حازر کە. بەمە وەڕەزیان کردبوو. ئەویش وتی: «برا بەرە تاشیومەو تفە لەدەممایە، ئیتر چی خۆم حازر کەم؟»

- کابرایەکی پیری دەوڵەمەند کوڕێکی هەبوو، رۆژێک کابرا قسەی ئەکرد بۆ خەڵکی ئەیوت: من هیچ ئەولادم نەئەبوو، چوومە سەر دار شەخسەکەی «بانی بنۆک» لێی پاڕامەوە خوا ئەم کوڕەی دامێ. کوڕەکە گوێی لێ بوو، رووی کرد بەو لاوە، بە هاوڕێکانی وت: «بریا منیش ئەو شەخسەم ئەزانی لە کوێیە بچوومایە لێی بپاڕایامەوە باوکم زوو بمردایە».

- مفتیزەهاوی، وەکو مفتی زەهاوی بوو پیاوێکی کوردی دەشتەکیش بوو. هەموو جار سنگ و بەرۆکی بەدەرەوە بوو. رۆژێک لە بە غدا یەکێک لە عەرەبەکان پێی ئەڵێ: «بەخوا ئەمە زۆر عەیبە بۆ تۆ کە بەو جۆرە سنگ و بەرۆکت بەدەرەوە بێ». ئەویش بە سەبری جووبەو کەواکەی ئەداتەوە بەسەر سنگیا و ئەڵێ: «ئەگەر عەیب هەر ئەوەیە ئەوا دامپۆشێ».

- جارێک مفتی زەهاوی لە بەغدا بەکاروانسەراییێکدا تێ ئەپەڕی سەیر ئەکا لەسەر قاپی خانەکەوە نووسراوە «لولا الاكراد لهلك الحمار». ئەمیش لەژێریا ئەنووسێ «لولانا لهلكتم».

- خەڵکی مستەفای میروەیسی شاتری ئەیوت: «خزمی خراپ وەکو گونی قۆڕ وایە؛ ئەیبڕی ئەتکوژێ، نایبڕی ئابڕووت ئەبا».

- کامل‌چادرچی لەبەغدا بۆی گێڕامەوە وتی: لەساڵی ١٩٤٩دا بوومەلەرزەیەک لە بەغدا پەیدا بوو. دنیا شەو بوو؛ من نووستبووم ئاگام لێ نەبوو. بەیانی کە هەستام پێیان وتم. لە هەر کەسم ئەپرسی هەریەکە قسەیەکی ئەکرد: یەکێ ئەیووت تەنیا دوو دەقیقەبوو، یەکێک ئەیووت پێنج دەقیقەبوو، قسەیەکی ساغم دەست نەکەوت. وتی پیاوێکی کوردمان لابوو لەوم پرسی. وتی تۆزێ سەری داخست و لە پاشا سەری بەرز کردەوە وتی «جگەرەیەک هەڵگرە نەفەسێکی لێدەو نەفەسەکە بدەرە دواوە هەر ئەوەندە بوو». کامل وتی لەقسەی ئەو کابرایە پوختەتر نەمبیستبوو.

- ژن و مێردێکی کوردەواری گەنجییان پێکەوە رابوارد و زەمانێکی دورو درێژیان بەسەر برد، هیچ ناخۆشییەک نەکەوتە بەینیانەوە. لەدەوروبەری پیریدا کابرا بوو بەئاگر و چووە گیانی ژنەوە. ژنە نەیئەوێرا لێو هەڵێنێتەوە کابرا دەستی ئەکرد بەقسە وتن پێی. رۆژێک ژنەکە وتی «ئەرێ پیاوەکە! من نازانم تۆ بۆچ وات لێ هاتووە. جاران من ئەمووت سندان، تۆ ئەتووت لە دەورت گەڕێم. من ئەمووت قوزەڵقورت، تۆ ئەتووت بە ساقەی زمانت بم؛ کەچی ئێستا پێت ئەڵێم بەقوربان؛ تۆ ئەڵێی سەگباب. ئەمەبۆچ وات لێ هاتووە؟» پیاوەش وتی «ژنەکە واز بێنە لەسەری مەڕۆ، ئەوی بەینی من و تۆی خۆش ئەکرد نەماو بەسەر چوو».

- مەجیدیەعقووبی لە ساڵی ١٩٣٣دا متەسەڕیف بوو لە سلێمانی. ئەو ساڵە مشکە کوێرەو بەراز لەو ولاتە زۆر بوو. کاغەزێکی نووسی بۆ مدیریەتی زراعە لە بەغدا کە هەندێ دەرمان بنێرن بۆ ئەوەی ئەو مشکانەی پێ بکوژن. ئەم کاغەزەشی زۆر بە پەلەپەل نووسیبوو، بۆ ئەوەی زوو دەرمانەکە بنێرن. مدیریەتیش بە جوابێکی رەسمی جوابی دابۆوەو نووسی بووی: «لەم رووەوە قسەمان لەگەڵ وەزارەتی ئیقتیساد کردووە، وەزارەتیش قسەی لەگەڵ شەریکەدا کرد لە "لەندەن" بۆ دەرمان. شەریکەکە وتی وا ئیرسالیەی تازەتان بۆ ئەنێرین». مەجید یەعقووبیش لە جوابی ئەو کاغەزەدا نووسیەوە بۆ مدیریەتی زراعەو وتی: «ئەمرەکەتانمان گەیاند بە مشکەکان، پێمان وتن لە کونەکانیان نەیەنە دەرەوە تا ئیرسالیەی

دەرمانی تازە لە لەندەن دێت و ئەیکەین بە کونەکانتانەوەو ئەتانکوژین؛ بەلام بۆ بەرازەکان نازانین هەر عەینی شتیان پێ ئەڵێن یا دەرمانی ئەوان لە شەریکەیەکی تردایە؟ تکا ئەکەین جوابمان بدەنەوە».

- مەلاعیسایهەرتەل هەبوو جارێک ئەیوت: «خولای گەڵێ ئیشی وا ئەکا ئەزی تیا شەرمەزار ئەبم».

- دوو کابرای کورد بە دەشتێکا ئەڕۆن، سەیری ئەکەن دڕک و داڵ و کەردرێکی زۆری لێیە. یەکێکیان بەوی کەیان ئەڵێ: «ئەرێ برا، خوا ئەم گشت هەسان و چەوریە سانەی لە کوێ بوو کە ئەمانە گشت تیژ کاتەوە؟» ئەویتریش ئەڵێ «برا ئەوە تۆ ییژی چی؟ هەر لە گەڵ وتی: تێژ، تێژ».

- کابرایەک لە سنە هەبوو «مەولوو»ی ناو بوو. کابرایەکی قسە قوت و گاڵتەچی بوو. ماڵ کاولە ئەوەندە زل و ناکولۆکاریش بوو ئەتوت تاوێرە؛ کەچی کوڕێکی هەبوو ئەوەندە بچووک بوو، هەر وەخت کە لە گەڵیا ئەڕۆیشت ئەتوت هێلکەیە بەشوێنیەوە. لێیان ئەپرسی: مەولوو ئەمە کوڕێ خۆتە؟ ئەیوت: «نازانم دایکی ئەزانێ».

- حاجیئەورەحمانیکۆیی هەبوو، پیاوێکی دەولەمەند بوو کە دوعای ئەکرد ئەیوت «خوایە بە گەورەیی خۆت رەحم بە ئێمە بکەی، هەژارەکە قەیناکا راهاتووە».

- شێخسەعیدیمەسۆ پیاوێکی ئیجگار زەلام و ناکولۆکاربوو، لەوانە بوو لە بەر ئەوە ئەوەندە زل بوو بەوەدا رانەئەگەیشت بتوانی دەستەجلێک بەسەریەکەوە دروست بکا. رۆژێک بە بازاڕی سولەیمانیدا تێپەڕی، منالێک تووشی ئەبێ. منالەکە لە ژێرەوە سەیری ئەکاو لەم لەشەو بارە زۆر سەرسام ئەمێنێ. لەپاشا «ئەڵێ خەڵکینە! ئەگەر ئێستە قسەیەک ئەکەم پێم نالێن تەماشاکە ئەم هەتیوە هێشتا سەری لە هێلکە نەهێناوەتە دەرەوە کفر ئەکا، ئەگینە ئەرێ خوایە ئائەمە ئیشە تۆ کردووتە؟ چوار زەلامت خستۆتە سەریەک و ناوت ناوە زەلامێک. ئەمە چون ئەبێ کەچی هی وایش هەیە لە بەر بچوکی چووە بەئەرزا».

-کابرایەکی کورد رۆژێکی رەمەزان نەیتوانی بە رۆژوو بیت، هەستا چوو لە سوچێکی تاریکی ماڵەکەی خۆیانەوە دەستی کرد بەنان خواردن. کوڕێکی هەبوو بەسەریا چوو، گوێی لە ملچە ملچێک بوو، وتی: ئەوە کێیە؟ وتی: «رۆڵە باوکی سەگبابتە نانی خۆی ئەخوا لەخەڵک ئەترسێ».

- دوو کابرای کورد بە رێبواری رێیان ئەکەوێتە ئەو عەرەبستانە. ئەمانە نە حوشتریان دیبوو، نەدار خورما. تووشی کاروانێکی حوشتر ئەبن، لە زلی و ناکلۆکۆکاری حوشتر زۆر سەریان سووڕ ئەمێنێ. لەپاشا تووشی بێستانێکی دار خورماش ئەبن، دارخورماکان زۆر بەرز ئەبن. یەکێکیان ئەڵێ: «ئەرێ برا ئەمە چییە، خوا بۆچ ئەوەندە دارخورمای بەرز دروست کردوە پیاو دەستی نایگاتێ؟» ئەوی کەشیان ئەڵێ: «برا لەترسی حوشتر».

- مەحمووپاشای جاف لە «باخەکۆن» لەدیواخانی شێخی حیسامەدیندا پێکەوە دائەنیشن. لەو وەختەدا زابتێکی ئەفەندیش دێتە دیواخان و مەحمووپاشا ئەیناسێ و بە شێخی ئەناسێنی و ئەڵێ: یا شێخ ئەمە لە مەکتەب خوێندوویەتی و بووە بەزابت. با ئێمەش منالەکانمان بخەینە مەکتەب و فێری خوێندەواری ببن.

ئەوان لەم قسەدا ئەبن ئەفەندیەکە هەڵئەستی و ئەچێ تۆزێ لەولای ئەوانەوە بە پێوە دەست ئەکا بەمیز کردن. شێخ حیسامەدین ئەڵێ: «پاشا ئەمەیە مەکتەبێ کەوا تۆ ئەوەندە بەتانو پۆیا ئەچی؟ مەحمو پاشاش ئەڵێ: «یا شێخ! ئەگەر لە مەکتەب نەیخوێندایە میزەکەی ئەکرد بەسەرو چاوی ئێمەدا».

- کابرایەکی کرمانج لە هەولێر بە شانو باڵی مەلاسالحی کۆزەپانکەدا دێ ئەڵێ: «مەلا کلکی پێوە بڕسکێ وەکو مەلا سالحی کۆزەپانکە نابێ».

- لەبەغدا لە مزگەوتێک نوێژی خەوتنمان بە جەماعەت کرد، پاشان خەڵکەکە بەرە بەرە دەرچوون. ماینەوە سەر چوار کەس. یەکێک لەم چوارە کابرایەک بوو خەڵکی «عەفەر» بوو. هاتە وەختی دوعا کردن دەستی بەرز کردەوە وتی: «خوایە لەم چوارە خۆش ببە ئەوانیتر کەیفی خۆتە». لە پاشا پێم وت بۆچ وات وت، ئەی خەڵکەکەیتر؟ وتی: «چاویان دەرێت! بۆچ من پشت ماڵەی ئەوانم بۆیان بپاڕێمەوە».

- قوتوو جگەرەیەکی داری دەستکردی سنەم هەبوو وێنەی «ئەبوعەلی سینا»ی لەسەر هەڵکەنرابوو، لە بنەکەشیەوە نوسرابوو «فەیلەسووفی شەرق». کوڕێکی نەخوێندەواری خەڵکی سنە هاتە لام کە ناوی «باقر» بوو. وێنەی سەر قوتوەکەی چاو پێکەوت، وتی: ئەوە کێیە؟ وتم ئەوە نوسراوە «فەیلەسوفی شەرق ئەبوعەلیسینا». وتی: قوربان فەیلەسوف یانی چی؟ وتم یانی وردبین و زۆر شارەزا لە هەموو کون و قوشبنێکی حیکمەت و عیلما». تۆزی سەری داخست و لە پاشا وتی: «قوربان جا بێژە "فرەزان" ئیتر ئەمەی بۆ چەس».

- کابرایەک هەبوو زۆر لە سەگ ئەترسا، تەنانت لە تووتەکولەیەکیش هەر ئەترسا. پێیان ئەوت کابرا ئاخر «تووتک» چییە تۆ لێی ئەترسی؟ ئەیوت: «من لە خۆی ناترسم لەوە ئەترسم "گەماڵ" خەبەر ئەکاتەوە».

- یەکێ لە پاشاکانی عەجەم لە زەمانی زوودا فەرمانی دابوو هەرچی بەگزادەی هەورامی هەیە بیانگرن و چاویان هەڵکۆڵن. بەگزادەکانیان گرتبوون خستبوویانە ژوورێکەوە، خۆیشی لەسەر بانێک راوەستابوو سەیری ئەکردن. لەناکاو لە ناویانا کابرایێکی رووتەڵەی جل شڕی بەرچاو کەوت. بانگی کرد بۆم بێنن. کە بردیان لێی پرسی: کورە کا برا! تۆیش بەگزادەیت؟ ئەویش وتی «قوربان بۆ چاو هەڵکۆڵین بەگزادەم؛ ئەگینا تا ئێستا هەر کۆڵەداریان پێ ئەکێشام». پاشا کە وەلامەکەی پێ سەیر ئەبێ بەرەڵای ئەکا.

- دوو کابرا لە زۆران گرتنا بوون یەکێکیان ئەوی کەیانی دابە عەرزا. ئەوەی کە سەر کەوتبوو بۆ ئەوەی خۆی هەڵکێشی هات بەشان و باڵی ژێر کەوتووەکەداو وتی: «بەخوا ماڵ کاولە بە هێزە؛ تاخستم وەختبوو هەموو جمگەی شانم لە بەریەک دەرچێ». ئەوی ژێر کەوتووەکە هەڵسایەوە و رووی کردە خەڵکەکە وتی: «خەڵکینە! وەڵلا بڕوا مەکەن، وا مەزانن ئازایی ئەو بوو منی خستوە، لە حیزی خۆم بوو ئەگینە ئەو لەو پیاوانە نییە».

- یەکی لە مسکێنەکانی حەماغایسەراو ئەچێتە لای ئاغا داوای لنگە گایەکی لێ ئەکا، خۆیشی لنگێکی هەیە بۆ ئەوە جووتەکەی ئەو ساڵەی پەکی نەکەوێ. ئاغەش ئەڵێ:

بچن گا زەردی بدەنێ. کابرا ئەیەوێ بلێ ئاغە ئەگەر گاکە باش نەبێ بە کەلکم نایە، مەلا «ئەحمەدی لاسور»یش لە دیواخان ئەبێ خێرا دێ بە شان و باڵی گادا؛ بە جۆرێ باسی ئەکا کابرا هەر خوا خوایەتی زوو هەستێ و بە پەلە بچێ وەریگرێ نەوەک ئاغە پەشیمان ببێتەوە. ئەچێ بۆ گاران بۆ وەرگرتنی گازەرد؛ کە چاوی پێ ئەکەوێ تەماشا ئەکا ئەوەندە لاتە بە «لۆس» نەبێ راست نابێتەوە. هەناسەیەک هەڵ ئەکێشێ و ئەڵێ: «بریا، من گا بوومایەو مەلائەحمەدی‌لاسور باسی بکردمایە».

- حەسەن‌بەگی‌کاک‌بایز بە بایزاغای‌دیبوکری ئەڵێ: «بایزاغا ماڵی ئێوە زۆر بێ پەردەیە، هەر کەس دێت و ئەچێتە ژورەوە». مەبەستی ئەوە ئەبێ تانوتی لێ بدا. بایزاغاش ئەڵێ: «حەسەن بەگ، ژنەکانمان بەدڵی خۆیان پیاو ئەبیننەوە کوڕی وەکو من ئەهێنن؛ بەڵام ژنەکانی ئێوە مەیتەرە لەڕێک لە خۆیان ئەنێن کوڕی وەکو تۆ ئەهێنن».

- ژنێکی «بێسەریی» هەبوو «پیزە»ی ناو بوو. چوار کوڕی ئازاو بەناو بانگی هەبوو. ئەمانە بەرە بەرە لە ڕێگری و چەتەیەتیا کوژرا بوون. پیاوێکی گەورە لێی ئەپرسێ: «ئائەمانە چین تۆ خستوتنەوە؟» ئەیەوی بەم قسە تانوتی لێدا، ئەویش پێی ئەڵێ: «لەباتی ئەوە، ئەوە بە من ئەڵێی، بە باوکت بوتایە کە دایکی تۆی بناردایەتە لای ئێمە با لە پیاوەکانی ئێمە بیگرتایەو کوڕی وەکو کوڕەکانی منی بهێنایە؛ نە وەکو تۆ کە لە سەر دۆشەک و بە ترسەوە تەنانت لەگەڵ منیش قسە ئەکەی».

## تاقگەی ئێلاخ

- لالەسەرحەدروغزایی ئاشنایەکی سەڕاجی هەبوو زۆری خۆش ئەویست، هەمیشە لە قسە کردنیشا بەر بەرەکانییەکیان ئەکرد. شەوێک میوانی لالەسەرحەد بوو، بەیانی هێشتا لەخەوا بوو لالە سەرحەد هەڵی کوتایە سەر جێگاکەی نوکە شەقێکی تێوەژەند بانگی کرد: «ا کوڕە راستەوەوە؛گۆرانە هیزە نیوەرۆیە». کابرا بەدەم خەوەوە وتی: گەماڵە پیرە بە میوانیش ئەگەفی؟ لالەیش وتی: «ئا برا تۆ دەنگ! ئێمشەو خەوێکم دیگە، کەسێ وا نەو

فالەکەیم بۆ بگێڕێتەوە، با وە تۆی بێژم». سەڕاجیش وتی: تو بێژیی ئەگەر پچڕ پچڕیش بێ بە دەرزی و درەوش پێکەوە گیرو بەندی ئەکەم.

ئینجا دەستی کردە خەو گێڕانەوەو وتی: «سەیساق»و «بالانتەران»گوییان پێوەوێ، گویی دوژمن کەڕ وێ و چاوی گشت وردە شاتری و گەلایی کوێر وێ! لە خەوما گوێلکە مێچکەیەکمان گوم بووبوو شوێنم هەلگردبو، گەیمە ئەو دەشتی «نێرگسەجاڕە». روانیم پیاگێکی ریش چەرموگی نوورانی لە سەر بەردەکەی «مەحموو گاوانی» لێ هەلاژیاگە، گالۆکێکی وەتەنشت خۆیا راکێشاگەو بووزگێکی لاو خاسی لە بەر دەما وێسیاگە؛ چست و چالاک مەگەر هەر خۆم لە تافی کوڕێنیما وا وریا بوویێتم. پرسیم برا تۆ کێی و ئەو پیرە کێس؟ وتی: لالە ئەوە بینایی چاوانەو منیش «حەمەد رەسوولەڵلا»م.

لە دلی خۆما وتم پیاو! وەخوا خاس بوو ئێستا وە کەرامەت سۆراخی گوێلکەکەم بۆ ئەکا. چوومە بەرەوە سلاوێکم کرد. هیچ نەجمیا، بەلام وەلا لووتێکەوە بۆلەیەکی لێوە هات وەکو جواوی سلاوەکەی دابمەوە وا بوو. تەمام بوو توورە ببم بێژم کاورا سلاو سلاوی خوایە تۆ بۆچ خاس جوابم نادەیتەوە؟ وەگالۆکەکەت ئەنازی؟ حەمەد رەسوولەڵلا خێرا تێگەیشت، هاتە بەرەوە وتی: قۆروان ئەوە لالە سەرحەدە. لالە سەرحەد؟ ئینجا جمیاو چوار مەشقی لێ دانیشت و وتی: لالە وەخێر هاتی، مەڕوانە قسور، شەو نەخەوتووم، نیازمان بوو بیینە میوانی تۆ. جارێ ئەم دەشتەم لا خۆشوو، وا تۆزێ لێرە حەساینەوە. منیش وتم وە خێر بێی! فەڕو بەرەکەتت هاورد.

لەو وەختەدا لام کردەوە پێی کوڕەیەک لە چەمەوە هات، بانگم کرد، ئا کاورا بێ لاوەلا. کاورا وە هەلەداوان رای کرد هات. وتم بتبینم چۆن را ئەکەی؟ بچۆرە مال بێمە بێژەوە «خازە» میوانمان تێت. شەکە گێژەکە سەر ورن. گۆشتی شەکی گێژ فرە خۆشە. پێ کوڕە رۆی و منیش روانیمە بەرو بەر پشتینێ بینایی‌چاوان کیسەو سەویلم نەدی. سەویلەکەی خۆمم دەراورد؛ فرە خۆشەویستە لە لام. لەو سالەوە خازەم هاوردو چووبوومە تانجەرۆ سڵ بکەم، ئەو سەویلەم دۆزیبووەوە. کیسە تووتنیش هەر ئەو کیسە بوو کە لە کراسی منالی «قەیتولی» و خۆیشکەکەی مابووەوە، هەر چەن ئەوانیش پیا هەلئەمێزان بەلام خازە گ جارێ ئەیشۆرد. تووتنەکەشی کوڕگەل لە کاروانی بەغدایان داوو هەندێ تووتنیان بۆ هاوردم. تووتنەکە فرەخۆش و مەگەر تووتنی بەراوی «قای نەجە» هاوشانی بکردایە. سەویلێ خاسم تێکرد دامە دەس حەمەد رەسوولەڵلا بۆم بگرێ تا ئاگری بۆ ئەکەمەوە. هەسێ و بەردەکەم دەراورد، گازێ پۆشوی ناو دارم داگیرساند سەویلم لە دەست

سەندەوە و پووشم خستە سەر، قومێکم لێدا تا خاس داگیرسیا دامە دەم بینایی چاوان. مژێکی لێدا فەرمووی: لالە ئەم توتنەت لەکوێ بوو، فرە خۆشە بێژە جاخێکم بۆ دابگرن لەتەک خۆما ئەیوەم. وتم وەچاوان.

لەو دەمەدا تەماشامان کرد وا لە دورەوە برە سوارێک دەرکەوتن. کە هاتن من ناسینم. بینایی‌چاوان پرسی لالە ئەمانە کێن؟ وتم یا بینایی چاوان! کورگەلی تەرخانین، هاتگن بۆ پێشواز. وتی با بچن بەو لاوە فرە بێفەڕن. بە شوێن ئەوانا دەستەیەکی‌تر هاتن. پرسی ئەمانە کێن؟ وتم ئەمانە وردەشاترین. دیسان وتی ئەمانەش بێ فەڕن. کاروانێکی‌تر هاتن پرسی ئەمانە کێن وتم گەلالین. وتی ئەمانە هەر فرە بێفەڕن با چارەیان نەوینم.

ئەوا بینایی‌چاوان خۆی لەو سەرەوە دانیشتگە، حەمەد رەسوولەڵلا لەو لایەوە و منیش لەم لایەوە. هەروا قسەمان ئەکرد کەچی تاقمە سوارێکی فەقیانە شۆڕی، سەرو پێچ داری گشت جوان خاس، جوان خاس تۆز ئەکەن و هاتن. بۆرکەوە سوارێک لە پێشیانەوە تەڕاتێن ئەکا. بای غەزەو وە تۆزی قولیا ناگات. بینایی‌چاوان فەرمووی: لالە ئەمانە کێن؟ وتم ئەمانە کورگەلی روغزایین، ئەو سوارەش لە پێشیانەوە «قەیتولی» خزمەتکارتە. تومەز ئەمانە هەمووی کە کاورای پێ کوڕە خەوەری بردبوو، گشت هاتوون وە پێشواز.

بینایی‌چاوان فەرمووی: «ماشاالله، ماشاالله لە خێڵی روغزایی، لە قەیتولی سورکەوە سوار! ئا پێ بێژە چکێ نۆما سورکەوە با خێوی». منیش وتم: «قیتە! ئا بتوینم خۆم ئاسایی وجاخی باوکت روون کەرەوە». قەیتول ئاو زەنگی پیا هاورد، خێرو بیرویێ، نۆما هات وە خۆیا، سەری سوارێ بوو، کلکی سوارێک، قەیتولیش لە ناوەراستیا وەک حەمەد رەسوولەڵلا سواری بوراق بوویێ واو.

لەو سەر دەمەدا سەیری قەیتولم ئەکرد حەمەدرەسوولەڵلا سەری نابووە بنا گوێی بینایی‌چاوان. تێگەیشتم کە گەرەکیە وە بینایی‌چاوان بێژێ داوای نۆماکەی لەقەیتول بۆ بکا. وتم کاکە قسەی خۆت مەدۆڕێنە، قەیتول نەگریس و تووڕەو کەللە شەقە، لێت تووڕە ئەوێ، میوان نەوی خوایش وی نایدا. بینایی‌چاوان فەرمووی: محەمەد ئەم نۆمایە هەر بۆ قەیتول خاسەو هەر لەو دێت. من ئێژم وە رەییسی عەنزە چارەوییکی عەرەوی فرە خاس بۆ تۆ بنێرێ.

سا ئێمە لەم حەسیەو بەیسەدا بوین تێ‌فکریم وەک قەتارەی قولەنگ سەر یەک نیشتوێ هەر پێ کوڕەیەک سینێەک، یا سەلەیەک وە سەر سەرەوە نان هات، بەلام چە نانێک؟ پلاو گشت وەک مەلای سەر چەرمگ تەشوی ترشی حەسەن وەگی لە تەکا وە

قاورمەی شەکە گێژا دەورا دەور دریاگە. پیاگ ئەشیا بێژێ نان بو خوا دروس کریاگە. نان دانرا.

خولەی‌ئەلی کەوکوژ وەخۆی و زورنایەوە پەیدا بوو. بێ وە کەس پێ بێژێ پێکی زورنای لێ خۆش کرد و فیقاندی وە زورنادا، ئەوانەی نانیان هاوردوو کەوتنە ژەندن، کاورای دەهۆڵ ژەنی قلیاسانی وە فرکانی دەهۆڵێ گەیاند، لە تەقەی دهۆڵ و زورنا لە گشت لایەکەوە کەنیشک و شۆرە ژنی جاف گلێر بوونەوە. بووە رەشبەڵەکێک بۆ حەمەپاشایش ئەو زەماوەنە نەکریاو. جا برا کە بزانە چەن خۆش بوو وە دەنگی دەهۆڵ و زورناوە ئەو نانە نۆشی گیان کریا.

حەمەد رەسولەڵلا فەرمووی «شنینە» نەمزانی چی ئێژی، بینایی‌چاوان فەرمووی «دۆ»ی گەرەکە. مەشکە دۆ هات کاسەیان بۆ پڕ کرد، کەوچکی نەگەرەکو، هەروا کاسەی نا وە سەرەوە ئۆخەیچی کرد. منیش وتم نۆشی گیانت وێ!

هەروا لە دەنگی دەهۆڵ و زورنا مکایلی و سەدانی گلێر بوونەوە. بینایی‌چاوان پرسی لالە ئەمانە کێن؟ عەرزم کرد قوروان مکایەلین لە تەک ئێمەدا ناکۆکن. فەرمووی رایانکێشن بۆ جەحەنم. لە دەنگی زیڕەی ئەوان خەوەرم بووەوە.

کاتێ لالە سەرحەد ئەم خەوەی گێڕایەوە سەڕاج وتی لالە تۆ ییژی ئەم گشت تەحامەیان هاورد خۆ، من هێمان لە مالی تۆ چەشکەی برنجم نەکردگە. خازە هەر ییژێ برنج نەکوتیاگە، چۆن بەو دەم و دەستە کوتریاو لێ نریا؟ منیش ئیمشەو خوا وە خێری بنووسێ خەویکم دیگە. لالە سەرحەد وتی: ئا برا بێژە بزانم تۆچیت دیگە؟ سەڕاج وتی:

لەخەوما من زینێکم بۆ چارەوییە فلقەکەی تۆ دوریو، پارەت نەدابومێ، هاتم بە گژتا تۆیش دەستت لێ دابوومە شیر و سوباشی حەمە سالح بەگی قائم مقامی هەڵەبجە گرتنی و بردینیە دیوان. پرسی: ئەرێ گەماڵە پیرەی بێ کەڵبە گەفیگە ئەم پیاوە زینی بۆ دوریوی پارەت بۆچ نەداوەتێ؟ تۆ وتت میرم ها لە مالما بەخێوی ئەکەم پارەی چی بدەمێ؟ ئەمری کرد هەردووکمانیان راکێشا، منیان خستە چالی پیسایی ئەدەبخانەوە، تۆیان هاویشتە چالی هەنگوینەوە؛ لەشمانی تێوە چوو.

لالە سەرحەد هەڵیدایە وتی: «ئا ئاوا گۆڕت وێ خاس تیا گەوزای».

سەڕاج وتی ئەرێ وەڵلا تیا قورس بووبووم. لالە سەرحەد بەکەیفی بوو. کەوتە تیتالی، وتی خۆڕایی نییە بانگێشتنم بۆ بینایی‌چاوان کردگە. سەڕاج وتی: ئەوساکەش تۆ پێکەنیت، میر قینی هەڵسا ئەمری کرد: مەواشیر بدە لێیان و بێژە ئەشێ یەکتر بلێسنەوە. من

دەستم کرد وە لێیسانەوەی تۆ؛ فرە خۆش بوو. تۆیش دەستت کرد وە لێسانەوەی من. قیزت هاتەوەو بە سەریا رشایتەوە ئەوەیشیان بە زۆر هەر پی لستیەوە.

لالە سەرحەد دەستی کرد بە جنێودان و بە دەمیشیەوە هێلنجی دەدا و وتی: «دەوێت باوکە! ئەوە خەونە تۆ دیگتە؟» سەڕاجیش وتی: «ئەی گەماڵە پیرەی بێکەڵبە! ئەی خەوەکەی تۆ خەوە دیگتە قلیانت بۆخوا لە کیسە توتنی میزاوی تێکردو بۆ چارەویە فلقێک کە بە دزیەتی چنگتان کەوتوە قسەی خواو دڵی پێغەمبەرت شکاند؟»

-حەمەبەگیڕەسولبەگیموغاغ گێڕایەوە وتی: کابرایەکی شێنکی، «قوچاغلی» ناوبوو کە پێیان ئەوت «قوچە»و پیاوی «مەخول» هەمەوەن بوو. هەر چەن بهاتایە بۆ سولەیمانی لە ماڵی ئێمە میوان ئەبوو. ئێمەش منداڵ بوین بە شەو ئەچوین بۆ لای ئەو باسی جەردەیی بۆ ئەگێڕاینەوە. شەوێک وتی:

«جارێک لە گەڵ ساڵحی ئەحمەد نازێ و دوو سواریکە چوین بۆ بەری کۆیە. کاروانێکمان رووت کردەوە سێ ئێسترمان بە بارە برنجەوە هێنا. ئەو شەوە هەتا رۆژ بە بێ وچان هاتین گەیشتینە ناوچەی «شێخبزەینی».

زۆرمان برسی بوو، ئاوایێکی دە دوانزە ماڵیمان لێ دەرکەوت. یەکێ لە هاوڕێکانمان وتی با بچین لەم ماڵانە نانێک بخوین. ساڵح وتی وا دیارە ئەم ماڵانە فەقیرن ئەچینە دێیەکیتر. کابرا وتی: بابە! خۆ ئێمە تالانیان ناکەین یەکێ دوو نان ئەخوێن و ئەڕوێن. بە کوزی دایکیانەوە. بەم قسەیە نەختێ پێکەنین.

چوین تا نزیک ئاوایی لەوێ زەلامێک ئەسووڕایەوە، لێمان پرسی: برا پیاو ماقوڵی ئەم دێیە کێیە؟ وتی من و کاکەم. لێمان پرسی تۆ چی ئەکەی لێرە؟ وتی «تەپاڵە» ئەچنمەوە. وتمان ئەی کاکەت لە ماڵە بچین ببین بە میوانی؟ وتی: نەوەڵڵا شوانی گوێرەکەیە، وا لەو کەژە. ئیتر لووس و باریک بە سکی برسی بە جێمان هێشت.

دێیەکیتر نزیک هەبوو هاتینە ئەوێ. زەلامێک لە قەراخ ئاوایی وەستا بوو، لێمان پرسی: ئەم دێیە هی کێیە؟ وتی هی منە. وتمان ئەی تۆ چی ئەکەیت لێرە؟ وتی: فلانی مسکێنەکان سەگی زۆریان هەیە چاوەڕێم یەکێک بێت رەوانەم بکات. کە وامان زانی ناچار ئەویشمان بەجێهێشت.

دێیەکیتر دیار بوو کەسەیرمان کرد وا شایی و رەشبەڵەکە و بووە بە هەرا. وتمان دیارە لێرە شلپەیە، چوین خۆمانمان کرد بە ماڵێکی گەورەدا. بە راستی زۆر بە تفاق بوون.

- کابرایەکی جاف لەو بناری هۆیەتووە بوو بە مێوانی ماڵێک. ماڵەکە دوو سەگی ئێجگار دڕیان هەبوو؛ کابرا لە ترسی سەگەکان پێش نووستن نەی وێرا بچێتە سەر پێشاو. شەو گوو زۆری بۆ هێناو ناشوێری بچێتە دەرەوە؛ لە وانە بوو بیشیکا بە خۆیا. هیچ چاری نەدۆزیەوە لەوە زیاتر نەبێ کە ماڵەکە منالێکیان لە بێشکەدا هەبوو، هەستا بە دزیەوە چوو دەسرازەی منالەکەی کردەوەو پڕ گۆزەلەی منالەکەی کرد لە پیسایی.

زۆری پێ نەچوو بۆن و بەرامە ژوورەکەی پڕ کرد. باوک و دایکی منالە خەبەریان بوەوە. لەم بۆنە پیسە زۆر سەرسام مان کە منالەکەیان کردەوە گۆزەلە ئێقی کردوەتەوەو وتیان ئەم منالە تا ئێستا وای نەکردووە، ئەمە ئیشی منال نییە. کابراش لە ژێر جێگەکەیەوە گوێی لە قسەکەیان بوو هەلیدایە وتی: «برا تا ئێوە سەگی وا دڕتان ببێ منالتان لەوە زۆرتریش پیسایی ئەکا».

- یەکی لە سانە کانی هەورامان رۆژێک لە گەڵ مەلادا هەروا ئەچنە دەرەوە بۆ قەراخ ئاوایی و بە لای پەڵە زەوییەکی مەلادا تێئەپەڕن. سان خەبەری زەویەکە لە مەلا ئەپرسێ. مەلاش ئەڵێ: «جەنابی سان! ئەم قطعە ارزە کە واقع بووە لە بەر مدی نظرتانا لە بەر ئەوە ئەم سەنەیە مشۆمە قطرانی مطر لە ئاسمانەوە نزولی نەبووە و لە بەر ئەوەش کە بعیدە لە عین المائی قریەکەوە، بوو بە ارزێکی قاحل و بە غیر مزروعی لە سەر حالی سابقی دەوامی کرد».

سان هیچ لە قسەکانی تێنەگەیشت وتی: «ئانە چێش مەواچی؟» مەلا بەهەر جۆر بوو تێیگەیاند ئینجا وتی: (ئانە چێشن؟ واچە نەکالیان و بڕیاوە».

- کابرایەک هەبوو لە سولەیمانی «حەمەی نازێ» ناوبوو. ئەم حەمەی نازییە لەو دیوی گردەکەی «زێڕینۆک»ەوە بەرە جووتی زەوی هەبوو؛ هەموو ساڵێ ئەیکێلاو بەوە ئەژیا. ئەم کابرایە ئەوەندە تێنوو بوو بە باران ئەگەر دنیا ئاو بیبردایە ئەو هەر ئەیووت: «ناشوکری نەبێ! ئیمساڵ باران نیە، ساڵ ساڵی پار بوو». کە ئەکەوتە ساڵێکی‌تر چەشنی پێشوو بنێشتە خۆشەی بن دانی هەر ئەوە بوو ئەیوت: «ناشوکری نەبێ ئیمساڵ باران نیە؛ ساڵ ساڵی پار بوو».

- کابرایەکی عەلاف گەنم و جۆیەکی زۆری هەبوو؛ هەڵیگرتبوو بۆ گرانی. بە ڕێکەوت ئەو ساڵە باران تۆزێ دواکەوت و کابرا لە دەماخا بوو. ڕۆژێک کوتوپڕ هەورێکی هێناو وردە باران دایکرد. کابرا دەماخی شکاو لە تاو دلگرانی خۆی چووە ژوورەوە. دڵی بڕوایی نەئەدا کە بێت و بارانەکە ببینێ. کوڕێکی هەبوو هەموو جار ئەینارده دەرەوە پێی ئەوت ئا ڕۆڵە بچۆ بزانە ئەباری

یا نابارێ؟ کوڕەش ئەهاتەوە ئەیوت باوە وردەوردە ئەبارێ، شتێکی وا نییە. جارێکیان ئیتر کابرا ئارامی لێ هەلگیراو وتی: «رۆلە ئەو وردە وردەیە چاوی باوکتی کوێر کردوە».

- مەلا عومەری‌رەش لە حەسار کوڕێکی هەبوو، حەمەی ناو بوو. حەمە ئەچێ مێز ئەکاو دێتەوە باوکی ئەلێ «محەمەد کوڕم! چویتە سەر میرحاز؟» ئەویش ئەلێ «ئا». ئەلێ: «گووت کرد؟» ئەلێ «ئا». ئەلێ بە سەری بابت؟ ئەلێ بە سەری بابم.

- مەلایەک هەبوو مەلا سمایلی ناوبوو. تووشی کەسێک ببوایە بیویستایە یەکتری بناسن، کوتوپڕ سەلامێکی لێ ئەکرد پێی ئەووت: من سمەم ناوەوە کوڕی ئەحەم مالمان لە کۆنە کۆترە؛ فلانە کتێب ئەخوێنم لە فلانە مزگەوت و لە لای مامۆستای فلان دێ. تۆ ناوت چیەو چی ئەکەی؟

- کابرایەک بەردو ئەستییەکی هەبوو. لە ناو کورگەلا دانیشتبوو شانازی پێوە ئەکرد ئەیووت بەردو ئەستیی من یەکەو جار ئەیگرێ. کورگەلیش هەریەکە بە شان و بالی بەردو ئەستییی خۆیان ئەهاتن. لەم قسانە ئەم تووڕە بوو هەلیکێشایە بەردو ئەستێ و وتی: «تەلاقم کەوتبێ ئەبێ بیگرێ»؛ کەچی نەیگرت. ئەمجا دەستی راست کردەوەو وتی: «دەسا تەلاقم کەوتبێ ئەمجارە نایگرێ»؛ کەچی گرتی. وتی: «بەر یەکدی کەون».

- شایی بوو؛ هەرا بوو؛ هەلپەرکێ و زەماوەن بوو. کابرایەک بە کزیەکەوە لەو لاوە دانیشتبوو دەستی خستبووە ژێر چەناگەی. کابرایەک چوو پێی وت شاییە. وتی: «بە من چی». وتی بۆ تۆیە. وتی: «بە تۆ چی».

- کۆڕێک بوون لە لای من دانیشتبوون باسی پۆستەی میسرو عراق ئەکرا. کە کاغەز لە عێراقەوە ئەچێ بۆ میسرو پوولی پۆستەکەی ١٤ فلسە؛ کەچی لە میسرەوە دێ بۆ عێراق و پولەکەی ١٥ فلسە. ئەو فلسە زیادەیە ئەبێ لە بەر چی بێ؟

یەکێک لە کۆڕەکە بوو شێخ عەبدوللای ناو بوو، بە ساردیەکەوە وتی: «هەلبەت لە بەر ئەوەیە کە لەویوە بۆ ئێرە سەرەو ژوورە، بۆیە ئەو فلسە زیادەیە وەرئەگرن».

- حوسین قەرەداخی لە بەغدادا لە شوێنێک دائەنیشێ و لەو لاوە راست ئەبێتەوە روو ئەکاتە شێخ حوسین و ئەڵێ: «کەر، هەی کەر». ئەمیش بە بێ قسە هەڵئەستێ خێرا تەوقەیەکی لە گەڵ ئەکاو ئەڵێ: حوسین قەرەداخی. من هەر لە بەختانمە ئەم جۆرە شتانە بێتە رێم.

- حامد بەگی جاف زۆر کەم قسەی ئەکردو ئەیکا؛ کە هاتە قسە قسەیەکی وا ئەکا هەر تەواو جێگرە. لە گەڵ حامد بەگا بە لای خۆمانەوە زۆر دۆست بووین. لە ئۆتۆمۆبێل گلا بوو، نەچوو بووم بۆ سەر خۆشی. رۆژێک بە تەلەفۆن سەرخۆشی و چاک و چۆنیم لە گەڵ کرد، وتم سەرەتا نەمزانیبوو، پاشان ماڵە تازەکەشتانم نەئەزانی، بۆیە نەهاتم بۆلات. وتی: فلانی ئەم قسانەت لێ وەرناگرم ناچێتە دڵمەوە. وتم تۆ لەوە گەڕێ ئیستە خۆ شوکر چاکی؟ وتی: «شوکر سێ پەراسووم شکاوە و شانێکم دەرچووە، زۆر چاکم». راستی ئیتر من هیچم پێ نەما.

- مەلایەک هەبوو لەو دەشتی دزەییە. کوڕێکی لاساری هەبوو؛ هەر چەند پێی ئەوت بخوێنە ئەو بە گوێی نەئەکرد؛ وایان لێ هاتبوو دانیان لە یەک سپی بوو بووەوە. رۆژێک لە لا کۆلانێکا کوڕەکە بە گیر دێنێ و ئەم گفت و لفتەی لە گەڵ ئەفەرموێ:

«بە خۆم و بە عەسای یەدم و مخمرەی سەرم، لە بەر من نەبوایە عقرفوتیک اکلی ئەکردی. کەچی ئیستاکەش پشتی دایەتە جدارەکەوە ئەڵێ واللە لا اقرا».

- شێخ تۆفیق هەبوو رۆژێک ژنێک بۆ نوشتە کردن ئەچێتە لای. لە کاتی قسە کردنا ژنەکە پێی ئەڵێ: «مامۆستا تێ گەیشتی؟» شێخ هەر زۆر خراپ تووڕە ئەبێ و پێی ئەڵێ: «مردووت مرێ! من لە بستی شرح مواقف و شرح تجرید تێ گەیشتووم، ئیستە لە قسە دەڵە قۆڕێکی وەکوو تۆ تێ ناگەم؟» ژنەش لەم ناوانە و لەم قسانە سەری سوڕ ئەمێنێ و وەکو گوێزی بۆ بژمێرن وا ئەبێ.

- رۆژێک لە دیواخانێکا باسی نان بدەیی و بەخشندەیی ئەکرێ. شێخ قادری تاڵەبانی ئەڵێ کورە بەخشندەیی کەریەتیە. مامەشێخفەیزوڵلام چۆنکە ژیرە بزانە نانێک بە کەسێک ئەدا؟

- ژنێک هەبوو هەموو شەوێک دیزەیەک ئاوی ئەخستە تەنوورەکەوە بۆ مەلە کردنی ئیشی خێر. کە دیزەکەی دائەهێشتە تەنوورەکەوە ئەیوت: «ئەگەر بوو، بوو؛ ئەگەر نەبوو ئاوی هەویر».

- سالێک پشێویەک کەوتە سولەیمانیەوە. لەو پشێویەدا پیاوێک هەبوو حاجیعەلیکۆلەکیان پێ ئەوت و پیاوێکی دەولەمەند بوو. ویستی چەند دوکانێک دروست بکا. پیاوێکی ئاسنگەری هێنابوو بۆ ئەوەی ئاسنەکانی لە سەر دیوارەکەوە بۆ دامەزرێنێ. پێی وتبوو ئەم ئاسنانە جووت جووت بخاتە پاڵ یەک. ئاسنگەرەکە لە ئیشی خۆی بوەوە، حاجی چوو سەیری کرد، تەماشای کرد ئاسنەکان یەکە یەکە دانراون. بە ئاسنگەرەکە ئەڵێ: وەستا بۆچ وات کردووە؟ من پێم نەوتی جووتە جووتە دایاننێ؟ وەستاش ئەڵێ: «حاجی ئەم قسە کردنەی پێ ناوێ، لە پاش ساڵێکیکە ئەم دوکانانە ئەبن بە هی ئێمە؛ کەوابوو من خۆم ئارەزووم کرد کە وابێ، تۆ بۆچ ئەوەندە دڵت پێ ئەسوتێ؟» حاجیش ئەڵێ: «دڵم بە دووکانەکان ناسوتێ، دڵم بەو قەومە ئەسوتێ کە پیاوی وەکوو تۆی تیایە. ئەو پیاوە کە من پێی ئەڵێم بە پارەی من دووکان بۆ خۆت دروست کە؛ کەچی رازی نابێ چاکی دروست بکا؟»

- کابرایەک بە ریبواری ریی ئەکەوێتە ماڵە گۆرانێک. شەوی نان دائەنێن، کابرای میوان هەتا لووتی دێتەوە ئەخوا؛ هیچ نامێنێ. کابرای خانەخوێ بانگ ئەکا: ئا کچە نان بێنە. نانیتر دێنن. میوانە ئەویش ئەخوا. کابرا ناچار بانگ ئەکا نانیتر بێنن. نان نەماوە؛ ژنی خانەخوێکە ئەچێتە ماڵە دراوسێی پانزە بیست نانێکیتر بە قەرز دێنێ دایئەنێ. میوانە ئەویش ئەخوا لە پاشا کە هیچ نامێنێ، چار ناچاری دەست هەڵئەگرێ. لە دەمە دەمی نووستنا خانەخوێکە ئەپرسێ: «برا بە خێر ئەوە بۆ کوێ ئۆغر بێ؟» ئەویش ئەڵێ: «ئۆغرت خێر بێ! بە خوا مەعیدەم گیراوە، هیچم پێ ناخورێ. ئەچم بۆ سەر حەکیم». کابرا ئەڵێ: «کە واتە تکایکەت لێ ئەکەم، کە هاتیەوە بە لایەکیترا بچۆرەوە بۆ ماڵی خۆتان».

- فەقێیەکی ئەو موکریانە بە ناوبانگی مەلای قەرەداغەوە بە سەر سولەیمانیدا دێت و ئەچێ بۆ ئەوێ بۆ خوێندن. لە پاش شەوێک خێرا ئەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی کە بچێتەوە بۆ ولاتی خۆی. کە لێی ئەپرسن بۆچ وا خێرا گەڕایتەوە؟ ئەڵێ: «کاولم کردەوە! کورە بە بۆقلەموون ئەڵێن عەلی شیش». پێی ئەڵێن بابە تۆ دەخلت چییە بەوەوە کە بە بۆقلەمون ئەڵێن عەلی شیش؟ ئەڵێ: «کاولم کردەوە، قورعان وا بێ و سوێن وا بێ من شەو لەو ولاتە رۆژ ناکەمەوە کە بە بۆقلەمون بڵێن عەلی شیش».

– کابرایەکی دەرۆزەکەر لە بەر قاپی مالێکا راوەستابوو داوای شتی ئەکرد. منالێک لە مالەکە هاتە دەرەوە پێی وت: «خوا بتداتێ». کابرا وتی: «ئەی دەم و لەوەست خواتەوە، تەماشاکە چۆن هەر لەم منالیەوە فێری فلتە فلت ئەبێ».

– پیرێژنێکی پشت کۆماوەی پۆپ سپی ئەچێتە لای حەکیمێک ئەلێ: «پشتم ژان ئەکا». حەکیمەکە ئەلێ: هی پیرییە. پیرێژن ئەلێ: چاوم کز بووە؛ کەم شت ئەبینم. حەکیم ئەلێ هی پیریە. پیرێژن وتی: گوێم کەڕ بووە. وتی هی پیرییە. پیرێژن وتی: دانەکانم کلۆر بوون و هەموو کەوتوون. وتی: هی پیری یە. پیرێژن لەمانە زۆر تورە بوو دەستی کرد بە لاسایی کردنەوەی حەکیمەکەو وتی: «یە، یە، یە». حەکیمەکەش وتی: «دایە ئەوەش هەر پیری یە».

– کابرایەک لەو خوارە چووە شار و زۆری برسی بوو، هیچ پارەشی پێ نەبوو. بە بەر چێشتخانەیەکا تێپەڕی بە تەواوی ئیتر نەیتوانی بڕوا. چووە ژوورەوە بۆیان داناو تێرو پڕی خوارد. پاشان هەستا هاتە لای کابرای خاوەن چێشتخانەو وتی: «ئەرێ برا ئەگەر یەکێ پارەی پێ نەبێ و بێتە ئێرە چی لێ ئەکەن؟» کابرا وتی: «ئەوی پارەی نەبێ نایەتە ئێرە». وتی ئەوا وتمان پارەی نەبوو هاتیش». وتی: کەواو سەلتەو سەرو پۆتەلاکی لێ ئەکەینەوەو دەریئەکەینە دەرەوە. وتی: ئەگەر کەواو سەلتەو شتیشی لە بەرا نەبوو چی لێ ئەکەن؟ ئەویش وتی: چی لێ ئەکەین؟ ئەیگرین دوو شەقی تێ هەلئەدەین و ئەیکەینە دەرەوە. ئینجا کابرا پشتی هەلکرد وتی: دە براکە دوو شەقەکە لە من هەلدەن و بمکەنە دەرەوە.

– ئەم دوو سێ قسەشە بۆتۆ، یا بۆ ئوتومۆبیلەکەی تۆ:

ئەگەر چویتە بەغدا بە فیزیکەوە وە یا بە گێلە گێل بە ناو بازاڕ و کۆلانا ئەگەڕایت، کوتوپڕ سەیرت کرد دوو کەس لێیان بووە بە مرو مشت سەعاتێکی زرق و برقیان بە دەستەوەیە، یەکێکیان بە کوردی وەیا بە زرە کوردی قسە دەکا، هاتن بە لاتەوە. زرە کوردەکە وەیا ئەویکەیان وتی: «خالە ئەم کابرایە هەندێ پارەی لامە ئێستە ئەیەوێ سەعاتەکەم لێ بستێنێ لە باتی نیوەی پارەکەی؛ لەگەڵ ئەوەدا سەعاتەکەی من دوو ئەوەندەی پارەکەی ئەو یێنێ. وە یا وتی ئێمە لێک تێناگەین من کوردم و ئەو عەرەبە تۆ ببە بە دیلماجمان و ڕێکمان خە، تۆیش ئەکەویتە قسە. ئینجا دێتە سەر ئەوە ئەلێ خالە سەعاتەکەی من دە دینار دێنێ (بە میسال) ئەو ئەوەتە ئەلێ بە شەش دینار بیدە بە من، من ئەمە عەرەبەو سەگبابە نایدەمێ، تۆ کوردیت و لە

خۆمانی ئەتدەمێ بە چوار دینار، هەر بۆ ئەوە دەست ئەم سەگبابە نەکەوێ. جا کورە نەکەی تەماع بتگرێ و توخنیان کەوی. ئەوە درۆ ئەکەن و ئەیانەوێ دەستت ببڕن. هەرکە شتێکی وات چاو پێ کەوت ملی ڕێی خۆت بگرەو بڕۆ. نەکەی بە دەمیانەوە بوەستی و دەست بکەی بە کوێخایی و پیاو چاکی؛ ئەگینا دەردی پیاوەتی پیاوەکەی کەلی خانت لێ دێت. دوا جاریش نەڵێیت فلانی ئەی تۆ بۆچ پێت نەوتم.

- ئەگەر چویتە بەغدا بە فیزێکەوە وەیا بە گێلە گێل خەریک بووی ئەگەڕای، لەسەر ڕێگاکە لە بەر دەمتا سەیرت کرد کیسە پارە وە یا جزدانێک کەوتوە. تۆیش دەست ئەبەی هەڵیئەگری و ئەیخەیتە باخەڵت، کتوپڕ کابرایەکت لێ پەیدا ئەبێ و خێرا بە شوێن ئەودا کابرایەکی تریش پێت ئەڵێ: ئەو جزدانە هی منە تۆ هەڵت گرت. تۆیش بۆی دەردینی. وە یا لەوانەیە هەر نەتخستبێتە باخەڵت و بە دەستتەوە بێ. کابرا لێت وەر ئەگرێ و پاشان ئەڵێ وەڵلا باوکم خوا هەڵناگرێ ئەمە هی من نیە و ئەیداتەوە بە دەستتەوە پێت ئەڵێ من چاوم لێ بوو تۆ هەڵت گرت، ئەترسم جزدانەکەی خۆتت دابێ بە دەستمەوە؟ تۆش ئەڵێی نە وەڵلا باوکم ئەمەیە کە هەڵم گرت جزدانی خۆم لە باخەڵمایە. پێت ئەڵێ کامەتە بزانم با سەیرێکی ئەویش بکەم. تۆیش بە فیزێکەوە دەست ئەبەی جزدانەکەی خۆت دەردێنێ و ئەیدەی بە دەستیەوە. سەیرێکی ئەویش ئەکاو ئەڵێ بڕۆ خوات لەگەڵ. تۆیش جزدانەکەی خۆت وەرئەگری و ئەڕۆی لە پاش تۆزێک ئەتەوی پارە خەرج کەی، کە دەست ئەبەی و جزدان دەردێنی سەیر ئەکەی پڕیەتی لە کاغەزە شڕو پارەی تیا نەماوە.

تۆمەس لەو وەختەدا کە جزدانەکەی لێ وەرگرتووی بە تەڕ دەستی هەر لە بەر چاوتەوە پارەکەی لێ دەرهێناوە و بۆی پڕ کردویەتەوە لە کاغەزە شڕە.

جا برام ئەگەر چوویتە بەغدا فیز نەتگرێ بڵێت کێ ئەتوانێ شتی وا لە من بکا؟ ئاگات لە خۆت بێ، نە جزدان هەڵبگرەو نە جزدانی خۆشت بدەرە دەستی کەس. «نە ئەو ناولنگانەو نە ئەو زەبرە قوونانە». دواجار نەڵێیت ئاخر فلانی تۆ بۆچ پێت نەوتم.

کە چویتە بەغدا هەچ پارەیەکت پێیە لە شوێنێک دایمەنێ؛ بە تایبەتی کە چویتە بازاڕ و شت بکڕی و یەک دوو دینارێک بخەرە گیرفانێکت و بۆ ئەو وردە شتانە لەوە دەربێنە. ئیتر دەست مەکە بە ئەفەندیەتی و بابەکراغایی دەست بەری لە بازاڕ لە سەر دووکانەکانا باقە دینار دەربێنی. کابرای وەستا بە خۆی و دەمە گوێزانێکی تیژەوە بە شوێنتەوەیە. وەختێ خەبەرت

ئەبێتەوە کسپەیەک لە دڵتەوە دێت و ڕەنگت زەرد ئەبێ و ئەڵێیت ئای پارەکەم نەماوە. جا نە ئەو فیز فیزانیەو نە ئەم تیز تیزانیەش. دوا جاریش نەڵێیت ئاخر فلانی بۆچ پێت نەوتم.

## دوایی

ئەوا بەرگی دووەمی رشتەی مرواری لە ژێر چاپ دەرچوو؛ کەوتە بەر دەست خوێندەوارانەوە. من ماوەیەکی چەند ساڵیە لە گەڵ ئەم کتێبە خەریکم کۆم ئەکردەوە، لە ئەنجاما تا ئیستا دوو بەرگی لێ دەرچوو. لە بلاوبونەوەی بەرگی یەکەما سەیرم کرد لە لایەن خوێندەوارانەوە نوکات و قسەی خۆشم بۆ دێت بۆ ئەوە کە لە بەرگی دووەما بلاویبێتەوە. بەلام لە بەر ئەوە کە ڕێکخستنی ئەم بەرگە پێش ناردنەکەی ئەوان کەوت داخەکەم ڕێک نەکەوت کە ئەوانەش بلاو بکرێنەوە.

جارێ پێشەکی سوپاسی ئەو کەسانە ئەکەم کە ئەو شتانەیان بۆ ناردووم، سوپاسی ئەوەیان ئەکەم کە هەستیان بە خزمەتێک کردووە، بەو خزمەتە کە زمان و ئەدەبی کوردی پێویستە ببوورژێندرێتەوەو بخرێتە سەر کاغەز بۆ ئەوە لەمە زیاتر دەربەدەر نەبێ و نەچێتە گۆشەی لە بیر چوونەوە.

بەڵێ ڕێک نەکەوت لە بەرگی دووەما بلاو بکرێتەوە، بەلام ئەم کتێبە وەنەبێ هەر دوو بەرگ بێ. من فیکرم وایە بە یارمەتی خوا لە سەری بڕۆم و ئەدەبی شاراوەمان بە ئەندازەی توانا بەرە بەرە بیخەمە ڕوو، کەوا بوو ئەوانەی کە شتیان بۆ ناردووم لە بەرگی سێهەما بلاو ئەکرێنەوە و بەم زوانە بەرگی سێهەمیش دەرئەچێ.

هەر وەها تکا ئەکەم لەو کەسانە کە تینووی ئەدەبی کوردین، چی ئەزانن وە یا چییان بیستوە لە نوکات و قسەی خۆشی کوردی، لە ناردنەکەی درێخی نەکەن و بۆمی بنێرن. لەوان ناردن و لە من بلاو کردنەوە. ئومێد ئەکەم لەم ڕووەوە بە هۆی هەموو لایەکەوە ئەدەبی کوردی بگاتە ئاسمانی بەرزی و لە چاڵی بێنەوایی بێتە دەرەوە.

لە کردنی ئەم جۆرە ئیشانەو نوسین و چاپ کردنی ئەمانە دوو خزمەتی گەورە بە کورد ئەکرێ: یەکەم ئەم جۆرە شتانە لەزەتی دەماخەو دەماخ و گیان پێ پۆشە. بەو هۆیەوە ئەخوێنرێتەوە زیاد لە شتانی تر. لەمەوە کوردی خوێندن بلاو ئەبێتەوە، تەنانەت ئەو کەسانەش کە نازانن بخوێننەوە خۆشی کتێبەکە ناچاریان ئەکا بە خوێندنەوەو ئەمە بوو بە

قوتابخانەیەکی گەورە؛ دووەم خزمەتێکە بۆ ئەدەبی کوردی بە زمانی کوردی و کە لای ڕۆژگار ئەیهێڵێتەوە.

ئەم دوو شتە ئێمە ناچار ئەکا بە هەر شێوەیەک بێت، پێویستە خەریک بین و نەیەڵین ئەم خزمەتەمان لە دەست بچێت و هەر کەس هەر شتێکی لایە بە گوێرەی توانای کۆشش بکا بۆ زیندو بونەوەی.

## سەرەتا

*کورد کە بە کوردی خوێندی ئیتر خۆی بۆ خۆی ئەبێ.*

*خوێندنی رەمەکی کورد ئەوەیە کە بزانێ کوردە.*

وەختێ خۆی کە دەستم دایە نووسین و دانانی رشتەی مرواریییەوە بەو تەمایە بووم کە هەر ماوەیەکی درێژ ئەوسا بتوانم بەرگێکی لێ [لە] چاپ بدەم؛ بۆیەش ئەڵێم بەو تەمایە بووم چونکە وا رانەئەپەرموم کە زوو بڵاو ببێتەوەو بکەوێتە دەست خوێندەواران و ئەوان بکەنە کارێ کە لە سەر ئەو بیر و باوەڕە پاشگەز ببمەوە.

کەچی بە پێچەوانەی ئەوە ساڵی ١٩٥٧ کە بەرگی یەکەمی دەرچوو، زۆری نەخایان کە هانەهانەی خوێندەوارانی کورد کردیانە کارێ کە بەرگی دووەمیش بێت بە شوێنیا. ئێستێکی وایان کرد کە سوپاسگوزاریان بکەم. ئەم سوپاسگوزاریەش بۆ ئەوە کە قەومی خۆشەویستی کورد بە دڵ و بە گیان هەستیان بەوە کردووە کە خوێندنەوەی کوردی و خوێندنەوەی ئەدەبی کوردی مایەی بەختیارییە بۆ ژیان.

لە راستیشدا وایە؛ چونکە کە ئێمە وتمان خوێندەواری چرای ژیانە، ئەبێ ئەوەش بچێتە دڵمانەوە کە ژیانیش بە خوێندەوارییەوە ژیانە. ژیان هەر خواردن و نووستن نیە؛ ژیان ئەوەیە کە هەر کەس لە عاستی خۆی ئەبێ هەست بەوە بکا کە بۆ بەرزی قەومی خۆی ئەبێ بژی. بۆ ئەوە بژی کە قەومەکەی بەرز ببێتەوە. قەومیش بەرز نابێتەوە تا خوێندەوار نەبێ، خوێندەواریش نابێ تا بە زمانی خۆی نەخوێنێتەوە.

بەو بۆنەوە سوپاسێکی تایبەتیش ئەکەم بۆ خوا کە قەومی خۆشەویستی کورد بینی پێوە ناوە بۆ فێر بوون بە زمانەکەی خۆی. دیسان سوپاسیشم بۆ ئەو قەومەیە کەوا بە دڵ و بە گیان خەریکی خوێندنەوەو نووسینی زمانی کوردین.

سالی ١٩٥٧ دوو بەرگ لەم کتێبە دەرچوو؛ ئەوا ئێستەش بەرگی سێهەمی کەوتە بەر دەستی خوێندەوارانەوە. پشت ئەستوورم بە هانەی ئەوان کە بەرگی چوارەم و پێنجەم و هتدیش هەر ئەخوێننەوە.

عەلائەدین سەجادی- بەغدا

٢١/١٠/٢٦٥٧ی کوردی

١١/١/١٩٥٨ی فەرەنگی

## تاقی کراوەکانی کوردی

- سەرچاوەی هەموو عیلم و زانیارییەک تەجرەبەو تاقی کردنەوە بووە. ئادەمیزاد نەگیشتۆتە ئەم پلەو پایە بەرزە کە ئێستە هەیەتی مەگەر بە هۆی تاقی کردنەوە نەبووبێ.

ئەم تاقی کردنەوەش ئادەمیزادەکانی سەرەتایی کوتوپڕ شتێکیان بۆ ڕێکەوتووەو بەرە بەرە لەوەوە لە سەری ڕۆیشتوون تا گەیشتونەتە ئەنجام. وەکو ئەوە لە سەرەتاوە بە هۆی فڕێدانی با وە یا هاویشتنی ئینسانێکی سادەوە بە ڕێک کەوتووە لە بەردێکی‌ترو پزیسکەی ئاگری لێ بوەتەوە. لەم ڕێکەووتە کوتوپڕیەوە گەیشتونەتە شوێنێک کە توانیویانە خۆیان ئاگر بکەنەوەو پێویستی خۆیان پێ لابەرن.

هەر وەها کوتوپڕ بە ڕێکەوت یەکێک وە یا گیان لە بەرێک نەخۆش بووەو ئەو یەکە وەیا ئەو گیان لەبەرە گیایەکی خواردووە وە یا بریندار بووەو کوتوپڕ ئەو گیایە کەوتوە لە برینەکەی و پێ چاک بوەتەوە. وەیا دیویانە گیان لەبەرێک لە کاتی نەخۆشی و برینداریدا چووە گیایەکی خواردوە ئەمان چاویان لێ بوەو تاقیان کردوتەوەو لە ئەنجاما دەرکەو توە کە ئەو گیایە بۆ ئەو دەردە باشە.

وە یا یەکێک خەیاڵێک کەوتۆتە دڵیەوە. ویستویە ئەم خەیاڵە بهێنێتە دی. هێناویە بەرە بەرە خەریکی بوەو ئەوی لە دڵیا بوە بە دەست کردوویەتی. لەپاش چەند جارێک بۆی پێک هاتوە، ئەمجا لە شتی‌ترا کەوتوتە تاقی کردنەوەی و بە هۆی ئەم تاقی کردنەوەیە گەیشتۆتە سەر چاوەی ئیشەکە.

بە کورتی تاقی کردنەوە ئادەمیزادی لە تاریکی نەزانی خستە رۆژێکەوە کە سەر زەوی و بن زەوی و ئاسمانی رۆشن کردەوەو گەیشتە شوێنێک کە کەم شت ما لە دەستی دەرچێت.

قەومەکانی‌تر لە بەرە بەیانی مێژووەوە کە لێکیان لە تاقی کردنەوە وەر گرت و بەرە بەرە هەر شتێک ببوایە -با ئەفسانەش بوایە- ئەیانخستە سەر کاغەز و پاشان بە عەمەل و کردەوە ئەیانخستە سەر مێزی قسە لێوەکردن و لێکۆڵینەوە تا وایان لێ هات هیچ شتێک لە بن دەستیان دەر نەچوو. ئەم قەومی ئێمەیە -کە قەومی خۆشەویستی کوردە- بێگومان لە لاپەڕەی مێژوویا لەو رۆژگارانەدا کە لاپەڕە لاپەڕە هەڵیگێراوەتەوە بە هەزاران هەزار تاقی

کردنەوەی بووە و بە قسەگێراویەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی نەخراوەتە سەر کاغەز، هەمووی هەروا ڕۆیشتوەو وەکو بەردی گرانی بن ئاوی مەنگ گوم بووە.

ئەگەر ئەو قسانەی کوردی وە یا ئەو تاقی کراوانەی کوردی ئەمیش وەکو هی قەومەکانی‌تر لە زارەوە بخرایەتە سەر کاغەز و بخرایەتە ناو بۆتەی عەمەل و کردەوە، بێگومان ئێستە ئەمیش گەلێ کتێبخانەی ئەبو کە پێی بڵێن کتێبخانەی عیلمی و پشەو پزیشکی. ئەیبوو چونکە مادام کورد لە ژێر هەوای سافا و لە ژێر دەوارا ژیاوەو ئاوی ڕوونی سەرچاوەکانی خواردوتەوەو بە شەو سەیری گەڕانی مانگ و جریوەی ئەستێرەکانی کردوەو غایەلەیەکی‌تر نەهاتوە بە دڵیا کە پەردەکەی داپۆشێ، توانیویەتی شت بدۆزێتەوەو دەمی بۆ بەرێ. ئەمەی توانیوە بەڵام هەر ئەوەندە بوە کە ئەو قسەیەی پێی بگەیەنێ تا ئەنجامێکی دیاری و ڕووناکی لێ وەرئەگرێ.

ئەم باوەڕی بێ سەر و بەریە بە جۆرێک لە ناویا بڵاو بوتەوە، زۆرتر گاڵتەی بەو قسانە کردووە؛ تەنانەت ئێستەش ئەگەر قسەیەکی تاقی کراوی کوردی ببەیت دوور نیە هەر گاڵتەی پێ بکاو بڵێت ئەم ڕۆژە تازە[کەی] ڕۆژی ئەم قسانەیە؟ ئەو مەردومی‌تر دەست بۆ ئەو دیوی [دونیا] درێژ ئەکەن، ئەم تازە ئەم قسانەم بۆ ئەگێڕێتەوە.

لام وایە ئەگەر یەکێک ئەم قسەیە بڵێت هەقی نیە؛ چونکە ئەم تاقی کراوانە لە پاشماوەی ئەقڵی باو و باپیری ئێمەن. ئەگەر دەستی خزمەتیان بوایە ئێستە ئێمەش لەم ڕووەوە وەکوو قەومەکانی‌تر ئەبوین. ئەمەو دیسان لە بەچکەی «ژیشک» دڕکاویتر نیە، کەچی دایکەکەی ئەڵێ: لە بەچکەی من نەرم و نۆڵتر نیە.

جا لە بەر ئەمە من هاتم لەم تاقیکراوانەی کوردی چیم بەردەست کەوت نوسیمن و بۆ پاشە ڕۆژ هێشتمنەوە. ئومێد ئەکەم ئەمە ئەبێ بە بناغەی شتێکی گەورە بۆ ئێمە.

**کورد ئەڵێ:**

- ئەڵێن ئەگەر یەکێک تووشی «کەهەنگ»بوو[١٣]، خۆی بخاتە ئاوی ساردەوە چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێک دووپشک پێوەی دا دوپشکەکە -کە کوژرا- بخرێتە سەر ئاگر و بسوتێنرێ پاشان بخرێتە سەر شوێنەکە ژانەکەی ئەشکێ.

- ئەڵێن مشک زۆر گل و خۆڵی مارەنگاز ئەدا وە ئەمەش زیانی بۆ مارانگازەکە هەیە، ئەگەر بێتوو ئەو مشکە بە سەریا باز بدا ئەو مارانگازە ئەمرێ.

جا لە بەر ئەمە کورد دێنێ ئەگەر یەکێک مار پێوەی دا زەنگێک یا تەنەکەیەک یا شتێکی تر کە تەقەی بێت دایئەنێن و یەکێکی تر بە لایەوە دائەنیشێ و زەنگەکە لێ ئەدا وە یا تەنەکەکە ئەکوتێ و ئەیکا بە تەقە تەق. ئیتر مشکەکە لە بەر تەق و هۆڕەکە دوور ئەکەوێتەوەو نایە بە لای مارەنگازەکەدا.

- ئەڵێن ئەگەر منالێک سەری کەچەڵ بوو، جیوەی سوور لەگەڵ کەرەدا بگیرێتەوەو چەند جارێک لێ بدرێ چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێ «گرمەژنی» دەرکرد، بە توێکڵی شووتی بیهەنوون چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێ ئاژاوە لەماڵیا هەبوو، کەوشی تەنگ لە پێ کا ئەوی لە فیکر ئەچێتەوە.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێ چاوی کەم حوکم بوو، «بۆق»ی سەوز بێنێت «میل» بێنێ بە سەر پشتیاو بیکێشێتە چاوی چاک ئەبێتەوەو بیناییەکەی زیاد ئەکا، بەڵام ژانی ئێجگار زۆرە.

- ئەڵێن «شنگ» خواردن بۆ دەم و دان خراپەو بۆ ناو سک باشە. «ریواس» بۆ دەم و دان باشەو بۆ ناو سک خراپە.

- ئەڵێن ئەگەر دوپشک دای بە ئافرەتی سک پڕەوە لە پاشا ئەو منالەی کە لە سکیا بووە، لەو وەختەدا ئەگەر دووپشک پێوەی بدا ئیتر نایەشێ.

- ئەڵێن یەکێک هار بوو، خوڵی گوڕستان بکرێ بە سەریا، ئەمرێ.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێک لاواز بوو، ماوەیەک «چالەکە» بخوا قەڵەو ئەبێتەوە.

- ئەڵێن گیای «رکێشە» بنرێ لە برینی تیراوی چاک ئەبێتەوە.

---

١٣- کەهەنگ نەخۆشیەکە کوتوپڕ لە پشتەوە لە ژێر پشتێنەدا پەیدا ئەبێ و ئەو شوێنە ژان ئەکا. وا لە پیاو ئەکا پشتی کووڕ ئەکا.

- ئەڵێن «پێڵاو»ی سوور لە پێ کردن خەم ئەڕەوێنێ.
- ئەڵێن ئەگەر یەکێ دەستی هەر برین و زیچکاوی لێ ئەهات، خوێنی پشتی کیسەڵی لێ بدا چاک ئەبێتەوە.
- ئەڵێن پیاز بە کاڵی و بە کوڵاوی بە پیشاوی خواردنی بۆ کۆکەو هەڵامەت زۆر باشە.
- ئەڵێن چل بەیانی لە خورینی خواردنی حەو دەنک مێووژ وە یا پێنج دەنک بادام بۆ هێزو قوەت زیاد کردن زۆر باشە.
- ئەڵێن لە رۆژەکانی پێنجەی تارا هەر کەسێ بنوێ، هەموو ساڵەکە هەر خەوی دێت.
- ئەڵێن چاوێک بەفر بیبا، دووکەڵی «قانگ»ی بۆ باشە.
- ئەڵێن ئەگەر یەکێک سەرما بیبا، «حەمامی ژنان»ی بۆ بکرێ بەوە دێتەوە سەر خۆی. حەمامی ژنان ئەوەیە کابرا رووت و قووت ئەکەنەوەو ڕای ئەکێشن. سێ ژنیش وەکوو ئەو خۆیان رووت ئەکەنەوە. یەکێکیان لەم لای و یەکێکیان لەو لای ڕائەکشێن؛ ئەوی سێهەمینیش خۆی ئەدا بە سەریا. گۆشت لە سەر گۆشت ڕائەکشێن، ئەمجا نوێن ئەدرێ بە سەر ئەمانەدا. ئەمانە کابرا ئەگووشنە یەک، بە هەڵمی ئەمانە کابرا تینی تێ ئەکەوێتەوە کە تینی تێکەوت و هۆشی هاتەوە بە خۆیا، ژنەکان هەڵئەستن و کابرا بە نوێن دائەپۆشن تا بە تەواوی گوڕی پیا دێتەوە.
- ئەڵێن خواردنی رۆنە گەرچەک بۆ ڕەوانی باشە.
- ئەڵێن نۆک خواردن بۆ سک چوون باشە.
- ئەڵێن ئەگەر یەکێ مار پێوەی بدا، شیری کاڵ بخواتەوە باشە.
- ئەڵێن هەنگوین و کاڵەک خواردنیان پێکەوە زیانێکی زۆری هەیە.
- ئەڵێن یەکێ کە ژانی کرد «بلامانی» بتسێ باشە.
- ئەڵێن یەکێ ئاڵوی بکەوێ، پاروی گەورە بنێ وەیا پەنجە گەورەکەی بچەمێنێتەوە بەینی جومگەی یەکەم و دووهەمی بیا بە دەما ئاڵوەکەی چاک ئەبێتەوە.
- ئەڵێن ئەگەر یەکێ سەگەل گەمارۆیان داو کەوتە ناویانەوە، لە شوێنەکەی خۆی دانیشێ ئیتر لاقەی ناکەن.
- ئەڵێن دەستێ، قاچێ، شوێنێ کە شکا، کەرتە هێزەی تێوە پێچن چاک ئەبێتەوە.
- ئەڵێن ئەوانەی کە خەریکن هار ببن چاویان بە شتی سوور بکەوێ خراپتر ئەبن.

- ئەڵێن کەسێ گەوزەنی پێ بێ، کار و دووپشک نزیکی ناکەون. گەوەزن شاخی کەڵە کێوییە ئەکرێ بە دەسکی قەڵەمبڕو شتە.
- ئەڵێن رۆنی مەیمەن خواردن پیاو ئەخاتە جەمبازە.
- ئەڵێن منداڵ بە منالی بنەون لە باڵی و ڕایکێشن چاوی خێل ئەبێ.
- ئەڵێن هەر ژنێک چێشتی سوێری کرد، ئەوە ئارەزووی لە ئیشەخۆشەکەیە.
- ئەڵێن زەردوویدار تەماشای جولانەوەی ماسی بکا لە ناو ئاوا زەردوویەکەی ئەڕوا.

* * *

بە زۆرێکی زۆر گیرۆدەی دەست منال بوون. لەوانەیە سەریان لە خۆیان و لە منالەکانیش تێک داوە. هی واش هەیە نقە ئەکاو جقە ئەکا و شەخس و نوکتەو دوکتۆر ئەڕوا بۆ کەرتە منالێک؛ کەچی هەر بەو لاوە ئەچێ و هیچی نابێ. دیارە ئەمانەی کەوا منالیان نابێ، نەخۆشی و ناتەواویەک لە لەشی خۆیانا وەیا لە لەشی پیاوەکانیانا هەیە؛ یا پیاوەکە تووی نیە، یا ژنەکە منداڵدانی زەدەیەکی تیا هەیە. جارێ لەمەیان بگەڕێین.

باری منال زۆر بوونەکە تەنگو چەڵەمەیەکی زۆر گەورەیە بۆ زۆر کەس لە زۆر شوێنا. دوور نیە دوکتۆرەکانی عالەمیش بە دەست ئەم مەسەلەوە دامان و هەر یەکە قسەیەکیان کردووەو هەر یەکە جۆرە چارێکیان وتووە؛ لەگەڵ ئەوەیشا نەگەیشتوونەتە ئامانج. ئەمەو دیسان هەر شتێک لە سەر پێ و شوێنی تەبیعەت لاچوو لە لایەکیترەوە زیانی هەیە. زیانەکەش ئەوەیە وا بلێن کە مەکینەی لەشی ئەم ئافرەتە تەواوەو ئامادەیە بۆ منال بوون، ئەگەر هاتوو بەر بەستی ئەوە بە دەرمان و بە شتومەکی دەستکاری، دەستکاری کرا ئەوە مەکینە ئەسلیەکە لە سەر ئیش کردنی خۆی بە زۆر لادرا. شتێکیش کە بە زۆر لابدرێ لە سەر ڕێ و شوێنی خۆی گومانی تیا نیە کە زیانی هەیە.

ئەم لایەنەش (لایەنی منال زۆر بوون) بۆیە ئەوەندە بووە بە تەنگوچەڵەمەی عالەم، چونکە شەرت لەم رۆژەدا هەر منال فرێدان نییە، شەرت بەخێو کردن و تەربیەت دانە. شت کە زۆر بوو، نە ئەو بە خێو کردنە ئەبێ وە نە ئەو تەربیەتە ئەبێ کە ئیمڕۆژ پێویستە. باوک و دایک نازانن لا بە لای کامیانەو بکەنەوەو تەربیەتی کامیان دادەن. ئەمە بێجگە لەوە کە ئەم باوک و دایکە لە ژیانا هیچ حەسانەوەیەکیان دەست ناکەوێ، دوور نیە تاوانێکیشە کە بەرانبەر بەم منال زۆریە ئەکرێ.

جا من -بە خێری خۆم- دەرمانێکم لایە کە هیچ زیانێکی تەبیعیشی نەبێ بۆ ئەو مەکینە ئەسلیەی لەشی ژن و پیاوە. ئەیلێم، ئەوی بە جێ هێنا بە جێ هێنا، ئەوەش کە نەیهێنا بە دەردی خۆیەوە با بتلێتەوە. ئەم دەرمانەش زۆر کەس داوایان لێ کردووم بە پارە، بەلام من قازانجی تێکڕایی ناگۆڕمەوە بە پارە. لەم ڕووەوە ناچارین ئەبێ زۆر بە بێ پەردەو ئاشکرا قسە بکەین:

ژن لە مانگێکا جارێک حەیز (عوزری شەرعی) پیا دێت. دیارە لەو ماوەیەدا پیاو توخنی ناکەوێ. ماوەی حەیزەکەی سێ ڕۆژە، پێنج ڕۆژە، حەو ڕۆژە. هەر چەندە هەیە لە بەر نەچوونی پیاوەکە بۆ لای وە لە بەر خڵتەو لیتەی ئەو خوێن و هەراو بەزمە، منالدانەکەی بە هیچ جۆر ئامادەی منال وەرگرتن نیە؛ واتە ئەگەر بە کوتەکیش ئاو شەهوەتەکەی تێ بکرێ وەریناگرێ.

ئەو ڕۆژە کە لە حەیزەکە بووەوە هەمو ئافرەتێ خۆی حەسابی خۆی ئەزانێ. لە پاش ئەو ڕۆژە تا ماوەی پێنج ڕۆژ منالدانەکەی خالی ئەبێ لەو هێلکانەی کە منالی لێ دروست ئەبێ. لەو پێنج ڕۆژەدا پیاوەکە ئەتوانێ بچێتە لای و هیچ موتوربەو پەیوەندیەک دروست نابێ. چونکە شتومەک و ئەسپانی موتوربە پێک نەهاتووە.

ئەمجا لە پاش ئەو پێنج ڕۆژە تا ماوەی یەک حەفتە کوورە بە جۆشەو منالدان پڕی ئەبێ لە هێلکەی بێخەوشی منال. لەو ماوەیەدا -ماوەی حەوت ڕۆژەکە- ئەگەر پیاوەکە چووە لای و ئاوەکەی ئەم چووە منالدانەکەوە، ئەوە موتوربە ئەبێ و بناغەی منال پەیدا ئەبێ. تەنانەت لە پاش ئەو حەفتەیە گەلێ جار ئافرەت هەست ئەکا کە ئاوێکی لینجی زیچکاوی پیا دێتە خوارەوە، ئەوە ئەو ئاوەخڵتەی هێلکە پیسەکانن و بە بێفەڕی دەریان ئەداتەوە.

بەلام بۆ پێکهێنانی ئەم ئیشە زانینی حساب و حساب تێکنەچوون زۆر پێویستە؛ هەر لە گەڵ حسابەکە تێکچو ئیشەکەش تێک ئەچێ، ئیتر تۆ بە خێر و من بە سەلامەت.

- ئەڵێن یەکێک ئەکەوێتە نزگەرە کردن و هەر لە کۆلی نابێتەوە، کوتوپڕ لە ناکاو خەبەرێکی ناخۆشی بدەنێ نزگەرەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

- ئەڵێن منال بە کۆرپەیی نینۆکی بکری دز ئەبێ.

- ئەڵێن منال کە تازە پەیدا ئەبێ و دایکەکەی زێستانە، تا چل شەو چرای بە ژور سەرەوە دائەگیرسێنن.

- لە ناو ئەو کوردەواریەدا باوە منالی تا دوو سالان، ئەگەر هاتوو زۆر گریا وەیا هەموو جار کوتوپڕ ڕائەچەنی لە خەو، ئەڵێن ئەمە گۆیا ترساوە. بۆ ئەم ئیشە دێنن قورقوشم ئەتاوێننەوە جامێکی خالی لە سەر منالەکە ڕائەگرن و قورقوشمە تاویاوەکە بەو نیازە کە ترسەکەی لاچێ، تێ قلپ ئەدەنەوە. ئیتر ترسی منالەکە لائەچێ و گویا قورقوشمەکەش کە «مەیی» ئەبێ، بەوێنەی ئەوشتە کە منالەکەی لێ ترساوە.

-ئەڵێن منال کە تووشی نەخۆشی مانگ[١٤] بوو، جامێ ئاوی لە سەر ڕائەگرن و حەو پشکۆی تیا ئەکوژێننەوە نەخۆشیەکەی ئەڕوا.

- ئەڵێن بە گسک لە منال دان تەمەنی ئەو منالە کورت ئەکاتەوە.

- ئەڵێن یەکێک ئەگەر «موو» لە پەنجەی هات، «گا»یەک بێنن کونە لووتێکی گاکە بگرن و کابرا پەنجەکەی بکا بە کونە لووتەکەی تریا و گاکە هەڵپژمی. نێرەکە لە بن دێت و چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن یەکێک ئەگەر «دلۆ»[١٥] لە پەنجەی هات، ئەنگوستیلەی پۆلا بکاتە ئەو پەنجەیە چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن یەکێک روتوبەت و ژان و با کەوتە شوێنێکی لەشیەوە، خوری نەشۆراوی لێنێ و بەشتێک بیپێچێ چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن «بنێشتەتاڵ»و «زاخ» تێکەلاو بکرێن و بیسوون بە پارچە پەڕۆیەکاو بیخەنە سەر ئەو شوێنە کە باداری لێیە چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن ئەو شوێنە کە ژان و بای لێیە، گەلای «بناوە تۆ»ی لێ بنێن چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن شوێنێک لە لەشی عینسانا کە ژان و بای تێدا بوو، بنێشتەتاڵ، ڕۆن گەرچەک و مێو، مۆمی هەنگوین، ئەمانە پێکەوە جوان بکولێنرێن تا ئەبن بە مەلحەم و ئەو وەختە لێ بدا چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن یەکی کە چاوی هاتە ژان، زاخ لە سەر نەپالە کێویلە ئەسوتێنێ و لە پاشا لە گەڵ شەکەرا ئەیسوێتەوەو تێی ئەکا چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێک «هەزار پێ» چووە گوێچکەیەوە، دێنن «هەزبیە»و «مەرزە»و «ئالەت و زەردەچوو» پێکەوە ئەکوتن و ئەیسوونەوە ئەمجا لە گەڵ گۆشتا ئەیکوتن و پانی

---

١٤- مانگ، ناوی نەخۆشیەکە تووشی منال ئەبێ و لە هەر شوێنە شتێکی پێ ئەڵێن.

١٥- دلۆ ئەوەیە پێستی بەینی نینوک و پەنجە رووش هەڵ ئەدا.

ئەکەنەوەو ئەیخەنە سەر گوێیەکە. هەزار پێ کە تێی چووە، بە بۆنی ئەوانەوە ئیتر دێتە دەرەوە.

- ئەڵێن زەردێنە هێلکە دێنن ئەیسوون بە هەر دوو بەرەلەپاو دەست بە یەکا دێنن تا وردە وردە زەردێنە هێلکەکە توند ئەبێتەوەو وەکو پرپۆلە هەڵئەوەری. ئەمجا دێنن ئاردی گەنمە بەهارەو ئاوی «هەمیشەجوان» -کە گیایەکە-و ئاوی رکێشەو کەرەی مانگا و رۆن گەرچک و ئەمانەی تێکەڵاو ئەکەن و پێکەوە ئەیانشێلن تا ئەبن بە مەلحەم. ئەو وەختە ئەیخەنە سەر ئەو برینانەکە زۆر کاریگەرن چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن ئەو شوێنەی کە گوللەی بەرکەوتبێ وەیا خەنجەر لێ درابێ وەیا کابرا لە شوێنێک کەوتبێتە خوارەوەو زام و برینێکی زلی تێ بووبێ و خوێنەکەی نەوەستێتەوەو چاک نەبێتەوە، بێنن لە پێشا هەنگوین بخەنە سەر برینەکە خوێنەکەی ئەوەستێتەوە، پاش ئەوە «هەوژە» و «بەرژەڤ» -کە ئەمانە دوو گیان- لەگەڵ مێو و مۆمی هەنگ و بنێشتەتاڵ تێکەڵاو بکرێ و ببێ بە مەلحەم و بخرێتە سەری چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن هەر برینێک کە زۆر سەخت و گران بێ، بە ئەندازەی قاپێک رۆن گەرچەک بێنن بە ئەندازەی هێلکەیەک کبریتی زەرد بخەنە ناویەوە. لە ناو مەنجەڵ یا دیزەیەکی تۆزێ فراوانا بیانکوڵێنن. ئەوەندە بکوڵێنرێ تا کبریتەکە رەش دائەگەرێ، پاش ئەوە دایبگرن تا سارد ئەبێتەوە. ئەمجا برینەکە کون بوو بە فتیلە ئەو مەعجونەی تێ هەڵکێشن ئەگەر هەر برینێ روالەتی بوو مەعجونەکەی لێ ئەدەن و ئەیپێچن چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن ریشەی زریشک بێنیت پاکی کەی، پاشان بیکوتی بۆ ئەمە شی ببێتەوەو ئەمجا بیکوڵێنی جوان جوان تا هیچ هێزی تیا نامێنێ؛ ئەو وەختە تلفەکەی فرێدەیت و دیسان ئاوەکەی بخەیتەوە سەر تا ئەوەندە ئەکوڵی هیچ ئاو نامێنێ مەگەر تەنها مەعجوونی رۆحی گیاکە نەبێ. ئەمجا بێنی تۆزێ لەو مەعجوونە بخەیتە سەر هەر برینێک کە خوێنی نەوەستێتەوە خوێنەکەی ئەوەستێنێتەوەو بە یەک دوو دەست برینەکەش چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن گیایەک هەیە پێی ئەڵێن «ئالەتەکێویلە». بیهێنی و بیکوتی بیخەیتە سەر ئەو شوێنە کە ژان و بای تیایە لە لەشی پیاوا، شوێنەکە ئەکا بە برین و هەچ ژان و بایەک هەیە لەو شوێنەدا لە برینەکەوە ئەیکێشی و پاشان برینەکەش چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن ئەو گیایە کە پێی ئەڵێن ئالەتە کێویلە بیهێنی و بیخەیتە سەر بالووک ئەیسووتێنی و هەچ بالووکێکی‌تر لە لەشا هەبێ هەمووی لا ئەبا.

- ئەڵێن جانەوەرێک هەیە سوور و پچکۆلەیە پێی ئەڵێن «گوێرەکە سوورە». ئەو گوێرەکە سوورەیە بیهێنی و بیگوشیتە سەر بالووک، زیچکاوێک لە قنگیەوە دەرئەچێ بە هۆی گوشینەکەوە. ئەو زیچکاوە بچێتە سەر بالووکەکە ئەو بالووکەو هەچ بالووکێ لە لەشیایە هەمووی چاک ئەبێتەوە.

* * *

- ژنێک بوو لە ئیسیاوا شەوێک دەم ئەنێتە کانیەک ئاو بخواتەوە، بە دەم ئاو خواردنەوەکە مارێک ئەچێتە ناو سکی. هەر چەند ئەم لاو ئەو لایان پێ کرد هیچ کەڵکی نەبوو.

پیاوێک هەبوو لەو دێیەدا «نوورە»ی ناو بوو؛ دەستی حەکیمی هەبوو. ئەویان هێنایە سەری. نوورە کە چاوی پیکەوت وتی من ئەم مارەی لە سک دەردێنم بە بێ ئەوەی ئافرەتەکە هیچی بەسەر بێت.

وتی بە ئەندازەی دوو بەرە لەپ گۆشتی لاڕانی مەڕێکم بۆ بێنن. گۆشتەکەیان بۆ هێنا. زۆر جوان لە گەڵ خوێ ئاوێکی زۆر زۆر سووری کردەوەو دای بە ئافرەتەکە وتی بیخۆ. کانیەک قەڵبەزەی ئەکرد لە قەراخ ئاواییەکە. وتی ئافرەتەکە بەرەنە بەر ئەو قەڵبەزەیە نزیک بە ئاوەکەو بە ئافرەتەکەی وت کە دەمی بکاتەوە. زۆری پێنەچوو مار لە تینوانا ئارامی لێ بڕاو سەری لە دەمی ئافرەتەکەوە هێنایە دەرەوە روبەڕوی ئاوەکەوە، ناشگا بە ئاوەکە. زۆرتر هەرەسی پێ هەڵگیرا و تینویەتی زۆری لێ سەند، وردە وردە ئەهاتە دەرەوەو ئەکشا بۆ ئاوەکە. هەر ئەهات و نزیک ئەبووەوە لە ئاوەکەو دەمیشی نە ئەگەیشتێ تا دوایی بە تەواوی هاتە دەرەوەو چوە سەر ئاوەکە. نوورەش وتی هیچ لاقەی مەکەن. ئافرەتەکەیان دوور خستەوە، مارە چووە سەر ئاوەکەو تێر ئاوی خواردەوە، ویستی بگەڕێتەوە قورس بووبوو نەیئەتوانی بڕوا. ئیتر بە ئاسانی کوشتیان.

ئەمجا هێنای داوای مەنجەڵێ «شیر»ی کرد. شیرەکەیان بۆ هێناو بە ئافرەتەکەی وت بیخواتەوە. ئافرەت هەر شیری ئەخواردەوەو بە ژەهرەوە هەڵی ئەهێنایەوە. ئەوەندەی شیر دایە تا ئیتر هەڵی نەئەهێنایەوە.

پاش ئەوە داوای هەنگوینی کرد. هەنگوینیشیان بۆ هێنا و بە ئافرەتەکەی وت دەست بکا بە هەنگوین خواردن تا سێ ڕۆژ ئافرەت خۆی گرتە هەنگوین و ئیتر بە تەواوی چاک بووەوە.

- ئەڵێن سەگ کە لوورانی، تا کەوشی بۆ هەڵنەگێڕنەوە لە لوورە ناکەوێ.

- لە ناو کوردا باوە، ئەوا یەکێک پێلاوەکانی دائەکەنێ، کە دایئەکەنێ دواجار سەیر ئەکا پاژنەکانیان رویان کردۆتە یەک. هەڵئەستێ ئەچێ لە بەریانا دائەنیشێ بە هەر دوو دەست پێلاوەکان هەڵئەگرێ ئەیانتەکێنێتە کۆشیەوەو پێلاوەکان دائەنێتەوە. پاشان دەست ئەباتە کۆشی و چنگی پڕ ئەکاو ئەیکاتە گیرفانیەوە. دیارە هیچیش لە کۆشیا نیە، بەڵام هەر وا ئەکات، گویا ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە ماڵ و پارەیەکی بۆ ئەگات.

- یەکێ کە بەرلەپی راستی خورا ماچی ئەکاتەوەو ئەیخشێنێ بە سەر سەریا، بەو جۆرە خوروەکەی لائەبا. ئەمە مانای ئەوەیە کە پارەی دێتە دەست، خۆ ئەگەر بەرلەپی چەپی خورا ئەوە مانای ئەوەیە کە پارەی لە دەست ئەبێتەوە؛ هەر ئەیخورێنێ و هیچی‌تر.

- لەو وەختەدا کە پیاو پێلاوەکانی دائەکەنێ، ئەگەر سواری یەک بوون، ئەوە مانای ئەوەیە سەفەری ئەکەوێتە بەر؛ جا لوتی کەوشەکە لە کوێ بوو سەفەرەکەی بۆ ئەوێیە.

- ئەڵێن پیاو بە شەو گوێ بخاتە سەر ئەرزەکەو هەستی خۆی بۆ ڕاگرێ تا حەو فەرسەخ چە دەنگ و سەنگێک هەبێ گوێی لێ ئەبێ.

- ئەڵێن ئەگەر ماڵێک یەکێکی چوو بوو بۆ سەفەر و کاروان، «قەلەرەش» هاتو بەیانیان لە دەور و بەری ماڵەکە دەستی کرد بە قڕەقڕ، ئەوە هاتنەوەی کەسەکە لە سەفەرەکەی لە ئیمڕۆ و سبەی دایە.

- ئەڵێن ئەگەر بە زستانان با ڕۆژیش زۆر خۆش و هەتاو بێت، چۆلەکە پەلاماری ژووری داو دەستی کرد بە هەڵپە کردن بۆ دان خواردن، ئەوە بەفرێکی زۆر قورس ئەبارێ و ڕەشایی لە زەوی ئەبڕێ.

- ئەڵێن لە ڕۆژی هەتاوو خۆشی زستانا ئەگەر چۆلەکە دەستی کرد بە مەلە کردن و باڵە فڕکێ، ئەوە باران ئەبارێ.

- ئەڵێن ئەگەرجومعە بوارۆ شەنبە وەش کەرۆ شەنبە بوارۆ پەنج و شەش کەرۆ.

- ئەڵێن هەر ئێوارەیەک ڕۆژ لە هەورا ئاوا ببێت نیشانەی باران بارینە.

- ئەڵێن ئەگەر هەور چوو بۆ ڕۆژ هەڵات، بڕۆ بۆ کاروان و باران ناباری. ئەگەر چوو بۆ لای جنوب ئەوە باران ئەبارێ، لە ماڵەوە دەرمەچۆ.

- ئەڵێن «شاخی مار» بکرێ بە مەشکەدا بەرە مەشکەی زیاد ئەبێ.

- ئەڵێن مار کە توپێنرا تا نەکەوێتە شەوێ و چاوی بە ئەستێرەی خۆی نەکەوێ بە تەواوی ناتۆپێ.

- ئەڵێن موروی شین بۆ چاوەزار باشە.
- ئەڵێن دووکەڵی تەپاڵە بۆ رەوە مێشولە باشە.
- ئەڵێن «گرێ» دار گوێز لە بەهارانا هەر کارەساتێک لە نزیکەوە روو بدا وە یا هەر شتێک بەویدا تێپەرێ لە ناو ئەوا وێنە ئەگرێ.
- ئەڵێن ژن و خانو و وڵاخی بەرزە ومیان بۆ هەیە.
- ئەڵێن پیاوی پشت مل پان بێ ئەقڵە.
- ئەڵێن پیاوی موو سووری کورتە باڵای هەنگاو زل، زۆر چاکەش لە گەڵ یەکێکا بکا ئاخرەکەی زیانی هەر لێ ئەبینرێ.
- ئەڵێن جل، کە لە بەرا درواپەوەو پینەکرا هەژاری دێنێ.
- ئەڵێن بە شەو گسک دان خراپە.
- ئەڵێن بە شەو مەنجەڵی رەش، دان بۆ خواستن خراپە.
- ئەڵێن ئافرەتی لەش پیس شیر بخاتە سەر ئاگر شیرەکەی ئەبزرکێ.
- ئەڵێن کراسی سوور کچ زوو گەورە ئەکا.
- ئەڵێن هەر هاوینێک زۆر گەرم بوو، ئەو زستانەی کە بە شوێنیا دیت زۆر سارد ئەبێ.
- ئەڵێن یەکێ کە ژێر پێی خورا ئەوە بۆ سەفەر و کاروان ئەچێ.
- ئەڵێن پێستی سمۆرە بۆ کیسەی پارە، سەر بە رزقە.
- ئەڵێن یەکێ سەری چاوی چەپ و چاوی راستی بفرێ تووشی خێر ئەبێ.
- ئەڵێن یەکێک کە لە دەشتەوە بە رێگەدا ئەرۆیشت، کەروێشک رێگەکەی بری، خراپە. ئەگەر رێوی بری چاکە.
- ئەڵێن کڵاو بە وەرگەڕاوی لە سەر بنییت، گرانی ئەبێت.
- ئەڵێن یەکێک کە چوو بۆ سەفەر و کاروانێک ئەگەر پێیان خۆش بوو بگەڕێتەوە، ئاوی روون رۆ ئەکەن بە شوێنیا؛ خۆ ئەگەر لێی بێزار بوون و ئەیانویست ئیتر نەیەتەوە دیزەی رەش بە شوێنیا ئەشکێنن.
- یەکێک کە ویستی بچێ بۆ شوێنێک وە یا ویستی ئیشێک بکا ئەگەر لەو وەختەدا یەکێک وە یا خۆی جارێک پژمی، ئەڵێ ئەوە سەبری هێنا و ئیتر دەست نادا بە ئیشەکەوە. خۆ ئەگەر دوو جار پژمی ئەڵێ ئەوە جەختی هێنا و زۆر چاکە؛ ئەچێ بە شوێنیەوە.

- ئەڵێن بە شەو گسک دان هەژاری دێنێ. جا لە بەر ئەمە ئەگەر هاتوو شەو پێویست بووبوو گسک بدرێ، دێنن پووشێکی لێ ئەشکێننەوە، وە یا گسکەکە ئەگرن بە گڕی چراکەدا تۆزێکی لێ ئەسووتێ و ئەو وەختە گسکەکەی پێ ئەدەن.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێ بە شەو تەماشای ئاوێنە بکا ئەچێ بۆ غەریبی.

- ئەڵێن بە شەو نینۆک کردن خراپە.

- مریشک هەر کە خوێندی خێرا دێنن سەری ئەبڕن، ئەڵێن ئەوە وەیشوومەیەکی پێوەیە. کە سەر بڕا ئیتر وەیشوومەکە ئەڕواو روو ناکاتە ئەو ماڵە. هەروەها کەڵەشێریش کە پاش شێوان و پاش خەوتنان خوێندی ئەویش هەر ئەو سەمەرەی هەیەو سەری ئەبڕن.

* * *

- لە رەوشی کوردەکانە ئەوا بووک دێنن، کە گەیشتە جێ، زاوا ئەچێ لە دوورەوە سێوێکی تێ ئەگرێ. هەروەها لەو وەختەدا کە بووکە پێ ئەنێتە ناو دەروازەی حەوشەی زاوا، زاوا قامیشێک ئەگرێ بە دەستەوەو ئەیدا لە سەر سەری بووک، گۆیا بەم ئیشانە سامی ئەنیشێتە سەری.

دیسان لەو وەختەدا کە بووک لە ژوورەوە دانیشتووەو پێخەسوەکەی بە لایەوەو زاوا ئەچێتە ژوورەوە(ئەچێتەپەردە)، کە ئەم سەری کرد بە ژوورەکەدا بووکەکە ئەبێ هەستێ. پێخەسوو دەستی ئەگرێ و ئەیداتە دەست زاوا و ئەڵێ «ئەوە ژنەکەت». زاوا دەستی ژن ئەگرێ و لەو وەختەدا چ بووک و چ زاوا کۆششی ئەوە ئەکەن کە پێ بنێنن بە سەر پێی یەکا گۆیا هەر کامیان پێش کەوتن ئەوە ئیتر سامی ئەمیان ئەنیشێتە سەر ئەویان. خۆ ئەگەر بووکەکە ئەمەی بۆ رێ نەکەوت، زاوا یەکەم جار کە داوای ئاوی لێ ئەکا بووکەکە هەڵئەستێ ئاوی بۆ بێنێ، لەو وەختەدا بەبێ ئەوە زاواکە ئاگای لێ بێ، قومێ لە ئاوەکە ئەکاتە دەمیەوەو ئەیکاتە ناو جامەکەو ئەمجا ئەیدا بە مێردەکەی بیخواتەوە. ئەگەر ئەم ئیشەی کرد گۆیا سامی ئەنیشێتە سەر مێردەکەی و ئیتر بە ئارەزووی خۆی ئەیڕانێ.

- ئەڵێن ئەوە کابرا ژنی هەیەو ئەچێ ژنێکیتر دێنێت، لەو وەختەدا کە بووک ئەگوێزرێتەوەو دێتە ژوورەوە ژنە کۆنەکە مەنجەڵێکی رەش دێنێ سەرەونخونی ئەکاتەوە ئەچێتە سەری. چوونە سەر مەنجەڵەکەو هاتنە ژوورەوەی بووکی تازە ئەبێ یەک بگرێ؛ گۆیا ئەم ئیشە بۆ ئەوە ئەکا کە بووکی تازە لە بەرچاو مێردەکەی بکەوێ. خۆ ئەگەر بیەوێ

ئیشەکەی چاکتر سەر بگرێ، هەندێ کلیشی بۆ حەوا ئەدا، جا بیگرێ یا نەیگرێ ئەوە شتێکی ترە، ئەمە دیسان هەر بۆ ئەوەیە کە مێرد لووت بە تازە بووکا نەینێ.

- ئەڵێن ئەگەر مانگ خەرمانە ئاخلەی دا ئەوە نیشانەی بارانە.
- ئەڵێن ئەگەر با لە لای قیبلەوە هات ئەوە نیشانەی بارانەو پێی ئەڵێن «بای ڕێژنە».
- لە ناو کورددا باوە ژنان ئەچن بۆ سەر شەخس. هەر ژنە بە نیازێک ڕێزەڵە بەردێک هەڵئەگرێ و نیازەکەی خۆی لە دڵا ئەڵێت و بەردەکە ئەنووسێنێ بە کێلی گۆڕی شەخسەکەوە. ئەگەر کێلەکە ڕێزەڵە بەردەکەی گرتە خۆی، ئەوە نیازەکەی جێبەجێ ئەبێ، ئەگەر نەیگرت هیچ.

- لە ناو کوردەواریدا باوە ئەگەر یەکێ قەیچی (مەقەست)ی دا بە دەست یەکێکەوە ڕاستەو ڕاست نایداتێ، یا ئەمە بۆی دائەنێتە سەر زەوییەکە، وەیا ئەمەتە ئەیخاتە سەر پشتی دەستی خۆی و دەستی بۆ ڕائەگرێ و ئەویش هەڵیئەگرێ.
- ئەڵێن ژن لەو وەختەدا کە «گونک»ی هەویر لە سوێنەکە هەڵئەگرێ، ئەگەر پرزۆڵە لە گونکەکە بووەوەو پەرت بوە دەری سوێنەکە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە میوان دێت.
- ئەڵێن منالی ساوا کە دەستی کرد بە گسک دان ئەوە نیشانەی هاتنی میوانە.
- ئەڵێن مریشک کە بە لادا ئەکەوێ ئەڵێن ئەوە باری خستوە، نیشانەی هاتنی میوانێکی وایە کە بە بارە دیاریەوە دێت.
- ئەڵێن پشیلە کە دەموچاوی ئەشوا ئەگەر دەستی هێنا بە سەر گوێچکەیا ئەوە نیشانەی هاتنی میوانە.
- ئەڵێن مریشک کە خۆی دۆزی نیشانەی ئەوەیە ئەبێ بە کەوە ڕۆژ و پاشان باران.
- ئەڵێن وورچ کە ئاگری چاو پێکەوت ئەکەوێتە جامبازەو بۆی دەرئەچێ؛ بە هیچ جۆر ناوێرێ نزیکی بکەوێ.
- ئەڵێن کە پیاو بە شەو چرای پێ بوو، سەگ ئیتر توخنی ناکەوێ.
- ئەڵێن هەر کەس نقوورچ بگرێ لە «دۆمە ژن» چەقۆ بە دەستی چاک تیژ ئەبێ.
- ئەڵێن پیاوێ کە لووتی زل بوو دەعباکەشی زلە. ئافرەتێ کە دەمی زل بوو بلامانی وانێکەکەی -ماشاللّه- فراوانە.
- ئەڵێن یەکێ تیکە (پاروو) لە یەکێ بفڕێنێ وە یا بیخوا ئەبێ بە شەڕیان.

- ئەڵێن مریشک کە پۆپەی سوور کرد ئەوە ئیتر دەمەدەمی هێلکە کردنیەتی.
- ئەڵێن کە گەڵا «کون» کرا باران ئەباری.
- ئەڵێن لە دوای «کێلە بەردینە» کردن، باران ئەباری.
- کە رەشە ولاخ «باپێچی» کرد کاڵە کۆنی لە مل ئەکەن.
- لەو ولاتی کوردەواریە کە مانگ گیرا تەپڵ لێ ئەدەن و تفەنگ ئەتەقێنن.
- ئەڵێن کە بێوەژن گوێزرایەوە، هەلامەت پەیدا ئەبێ.
- لەو ولاتی کوردەواریە کە نانی شایی بووک ئەخۆن، دەست ناشۆن.
- ئەڵێن ئینسانی پارەدار کلاوی چڵکنە.
- ئەڵێن یەکێ دومەڵی لێ بێ، ئەوە پارەدارەو دەری ناخا؛ دومەڵەکە دەری ئەخا.
- لەو ولاتی کوردەواریە کە مانگی سەفەر ئەڕوا، دیزەی رەشی بە دوادا ئەشکێنن.
- لە ناو کوردەکانا ولاغی خۆشەویست moorووی شینی لە مل ئەکەن لە بەر چاوەزار.
- لە رەوشتی کوردەکانا کە بووکیان گواستەوە کەڵەشێری بە سەرا هەڵئەدەن.
- ئەڵێن کە بووک ئەگوێزنەوە سواری ماینی ئەکەن.
- ئەڵێن پیاوی بێ ژن لە گوێ ئاگردانا کە دووکەڵی بۆ چوو، ئەوە ژنی جوانی بۆ ئەبێ.
- ئەڵێن ئافرەت کە گرێی چارۆکەکەی کرایەوە ئەوە میوانی دێت.
- ئەڵێن ئەگەر یەکێ بەنەوخوێنی پسا ئەوە ئیشێکی ناخۆش دێتە پێشی.
- لە ناو کوردەواریدا ناڵەشاو کردن ئەکەن بە سەر کۆشک و خانووی تازەوە بۆ چاوەزار.

* * *

کورد وەکو ناوی رۆژەکانی هەیە، ناوی مانگ و ساڵی مێژوویشی هەیە. لە گەڵ چوار وەختەدا، ئەوەندە هەیە ناوی مانگەکان لە هەر شوێنێک لەو ولاتی کوردەواری جۆرە ناوێکیان هەیە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هیچ پارچەیەکی نیە لە سەر شتێک پەکی کەوتبێ، تەنها ماوەتەوە سەر ئەوە کە دەستی خزمەت و دەستی نووسینیان بۆ درێژ بکرێ، بۆ ئەمە لەوە زیاتر ون نەبن.

من بە پێی توانا کۆششم کرد بۆ کۆکردنەوەیان. ئەوانەی کە لە هەر جێگایەکا تەنها ئەو مانگانە ئەناسن، من هێنام بۆ ئەوە هەموو ولاتی کوردەواری شارەزای هەموو ئەو ناوانەبن،

خستمنە سەر لاپەڕەی ئەو قاقەزە بە پێی هەر چوار وەختەوە لە ناو ئەمانەدا دوانزە ناوم هەڵبژارد و کردمن بە بناغە بۆ هەر دوانزە مانگەکە. بە تەواوی بۆ هەموو کەس دەر کەون لە بەرانبەر ئەوانەوە ناوی مانگەکە بە رۆژئاواییم دانا لە گەڵ مانگی فارسیداو بەرانبەری کردن بە رۆژەکانیان. بەلام مانگە عەرەبییەکان لە بەر ئەوەکە ئەگۆڕێن نووسینی و بەرانبەری پێ کردنیان لە گەڵ مانگی کوردەواریدا ڕێ ناکەوێ؛ ئیتر بەو بۆنەوە ئەوان نەنووسران.

## رۆژ و مانگی کوردی:

ناوی رۆژەکانی هەفتە:

شەنبە، یەک شەنبە، دوو شەنبە، سێ شەنبە، چوار شەنبە، پێنج شەنبە، هەینی (جومعە).

### ئەو مانگانەی کە هەر لایەک ناویکیان هەیە[16] و بەرانبەرەکانیان لە مانگەکانی فەرەنگی ورۆژئاوایی:

| کەژ | کوردی[17] | رۆژ | فەرەنگی و رۆژئاوایی |
|---|---|---|---|
| بەهار | **ئاخەلیوە**، نەورۆز، خاکەلێوە، دار پشکیو، هەرمێ‌پشکیو، هەرمێ پشکوان. | ٣١ | لە٢١ی مارت تا٢٠ ی نیسان (ماری ـ اپریل) فەروەردین، فارسی بورجی حەمەل. |
| | **گولان**، شەستەباران، ، هیلانەمە، بانەمەڕ. | ٣٠ | لە٢١ی نیسان تا ٢٠ ی مایس (اپریل ـ مایو) ئۆردیبەهەشت، فارسی بورجی سەور. |
| | **جۆ زەردان**، بەختەباران، باران وشان، باران بران، کەوبەدار. | ٣١ | لە٢١ی مایس تا ٢٠ی حەزیران (مایو ـ جوەن) خورداد، فارسی بورجی جەواز. |
| هاوین | **پووشپەڕ**، پووش‌کاڵ، جۆخینان، زەخیران، خەزیران، کردارەمانگ. | ٣٠ | لە٢١ی حەزیران تا ٢٠ ی تەمووز (جوەن ـ جولای) تیر، فارسی بورجی سەرەتان. |
| | **خەرمانان**، تیرمە، میوەگەنان. | ٣١ | لە٢١ی تەمووز تا ٢٠ ی ئاب (جولای ـ ئاغستۆز) مورداد، فارسی بورجی ئەسەد. |
| | **گەلاوێژ**، تەباخ. | ٣١ | لە٢١ی ئاب تا ٢٠ ی ئەیلول (ئاغستۆز ـ سبتمبر) |

---

١٦- خوێنەری هێژاباش دەزانێ ناوی مانگەکوردییەکان لە سای زمانی یەکگرتووەوە و هەروەها بارستی بەرچاوی پەرتووک و کتێبی چاپکراوەوە بۆ هەموان ئاشکرا و خویانە. بۆیە ئەو هەلانەی کە لە چاپەکەی ماموستا سەجادیدا بوو، لە گەڵ سەرچاوەکانی‌تر (هەنبانە بۆرینە، کوردستان و ...) بەرامبەر کران و دروستەکەیان نووسرا تا لێلییەک بۆخوێنەرانی هێژا پێک نەهێنێت.و.

١٧- چونکە ئێمە هەر دوو خشتەکەمان کردە یەک، ئەو ناوانەی کە کراون بە بناغە بۆناوی مانگەکان بە*bold*(ڕەش) نووسراون.و.

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | | شەهریوەر، فارسی بورجی سونبولە. |
| پاییز | **گەلاریزان**، داروەر، ئیلوَن. | ٣٠ | لە٢١ی ئەیلول تا ٢٠ی تشرینی یەکەم (سبتمبر- ئوکتوَبر). میهر، فارسی بورجی میزان. |
| | **خەزەلوەر**، باران پەلە، چرنەیەکەم. | ٣١ | لە٢١ی تشرینی یەکەم تا ٢٠ی تشرینی دووەم (اوکتوبر ـ نوَڤامبر). ئابان، فارسی بورجی عەقرەب. |
| | **سەرماوەز**، ،گردوز ، بەروبەز، چریەدووهەم. | ٣٠ | لە٢١ی تشرینی دووەم تا ٢٠ی کانونی یەکەم (نوَڤامبر ـ دیسامبر). ئازەر، فارسی بورجی قەوس. |
| زستان | **بەفرانبار**. | ٣١ | لە٢١ی کانونی یەکەم تا ٢٠ی کانونی دووەم (دیسامبر ـ جنوری). دەی، فارسی بورجی جەدەی. |
| | **ریبەنان** (یا ریبەندان)، چلەشور. | ٣١ | لە٢١ی کانونی دووەم تا ٢٠ی شوبات (جنوری ـ فقریە). بەهمەن، فارسی بورجی دەلو. |
| | **رەشەمە**، نەوروَزمانگ، میش پەر. | ٢٨ | لە٢١ی شوبات تا ٢٠ی مارت (فقریە- مارس). ئەسفەند، فارسی بورجی حووت. |

ئێستەمێژووی کوردی سالی ٢٦٥٧ە؛ **هەی فەرەنگی (روَژاوایی) ١٩٥٨ە؛ هی فارسی ١٣٣٦ە و هی هیجری ١٣٧٧ە.**

لەیەکەم روَژی مانگی هەرمێ پشکوانی ئەمسالەدا -کەبەر **٢١** ی مارت ئەکەوێ- مێژووی کوردی ئەبێ بە **٢٦٥٨؛ هی فارسیش لەو روَژەدا ئەبێ بە ١٣٣٧.**

## حساب‌راگرتنی زستان:

- کوردەکان لە بەر ئەوە ولاتەکەیان کوێستان و سەرما و سوَلەیە، لە بارەی هاتنی زستان و حساب راگرتنی زستانا چەند جوَرە حسابێکیان هەیە. یەکێکیان ئەمەیە کە پێی ئەلێن «کەلی خان»و «کلەزەردە» و ئەو روَژەی پێ نرایە ٢٦ی مانگی ریبەنان (١٦ی کانوونی دووەم) پێ ئەنێتە چلە. چلەی زستان لە روَژی پێنجی نەوروَز مانگ (٢٥ شوبات) دوایی دێت. لەو ولاتانەی کوردەواری کە توَزێ گەرمیانترن هەر ئەم حسابە ئەکرێ.

حسابێکی تریش هەیە کە ئەمەحسابی کوێستانە سەختەکانە:

لە سەر ئەم حسابە، دوو چلە هەیە: چلەگەورە، چلە بچووک. چلەگەورە ٤٠ روَژە؛ چلە بچووک ٢٠ روَژە. ئەمەشیان هەر چەندە بیست روَژە، بەلام هەر پێی ئەلێن چلە. بە هەر دوو کیانەوە دوو مانگ لە زستان تەواو ئەکەن.

حسابەکەی تریش بەم جۆرەیە: یەکەم رۆژی مانگی رێبەنان (٢١ی کانوونی یەکەم) پێ ئەنێتە چلەو ئەمەیان پێی ئەڵێن «چلەگەورە». لە ٩) مانگی چلە(٣٠ی کانوونی دووەم) دوایی دێت.

ئەمجا لە رۆژی ١٠ی مانگی چلە (٣١ی کانوونی دووەم) پێ ئەنێتە چلەکەی‌تر. لە رۆژی ٢٨ی مانگی چلە (١٨ی شووبات) دوایی دێت و ئەمەیان پێی ئەڵێن «چلەبچووک». لە شەوی پێنجی ئەم چلە بچووکەدا رکوڕی سەبا» ئەچێ بۆ کێو. لە شەوی شەشی ئەم چلەیەدا پشکۆ ئەکەوێ؛ کە پشکۆ کەوت، تینی هەوا ئەشکێ.

کوڕی سەبا کوردێکی راوچی بووە؛ ئیشی هەر دەرو دەشت و راو کردن بووە. لەو شەوەدا سەر لە ئێوارێ ئەچێ بۆ کێو، کە ئەو دەرئەچێ دنیا ئەیگۆڕێ ئەبێ بە کڕێوەو بۆران و دووکەڵ ئەکا؛ ئەبێ بە شەوێک ئیتر لە زستانا لەو شەوە ساردتر و تووشتر نابێ.

کوڕ کە پیرەژنی دایکی کوێر ئەبێ، خەڵکی ئاوایی یەکە ئەچن پێی ئەڵێن کوڕەکەت ئیمشەو رەق ئەبێتەوە. ئەویش هەڵئەستی بە کوێرەکوێر لە ژوورەکەی خۆی دێتە دەرەوە. سەیرێکی هەواکەو بۆنێکی کڕێوەکە ئەکاو تۆزێ مات ئەبێ. پێی ئەڵێن بۆچی وا مات بووی؟ ئەڵێ: «راستە ئەم شەوە تووشتر شەوێکە لە زستان، بەڵام ئەگەر کوڕ کوڕی من بێ، تا بەیانی دانانیشێ و هەر هاتوچوو ئەکا».

خەڵکەکە بە قسەکەی پێ ئەکەنن، ئەڵێن پیرەژنە خەڵەفاوە. ئەوە تف هەڵدەی بە ئاسمانا ئەیبەستێ تازە ئەڵێ ئەگەر کوڕ کوڕی من بێ دانانیشێ و هاتوچو ئەکا. بۆچ کڕێوە دەرفەتی ئەوە ئەدا کە کوڕە لەو شاخەدا پێ لە بەرپێ هەڵێنێ؟

ئەو شەوە بە هەر جۆر بێ رۆژ ئەبێتەوەو بەیانی خەڵکی ئاوایی هەموو شاڵ و پێتاو ئەبەستن بۆ ئەوە بچن تەرمی کوڕە بێننەوە، کوتوپڕ سەیر ئەکەن وا کوڕە لەو لاوە لە لاقە برغەی شاخەکەوە کەڵەکێویەکی کردووە بە سەر دارەکەیەوەو ناویە بە نەڕەی شانیەوەو بەرەو ئاوایی بووەوە. خەڵکەکە چوون بە بەرەو پێشەوازیەوەو پاشان لێیان پرسی کە چۆن سەرما رەقی نەکردۆتەوە؟ وتی: «سەر لە ئێوارە کە لە ماڵ دەرچووم و دوور کەوتمەوە، دنیا گۆڕا و بوو بە کڕێوەو تۆف؛ نە دار بە دەرەوە ما، نە ئەشکەوت ما، نە کێو و شاخ ما لە بەر بەفر و باران. وتی پەکم کەوت؛ ویستم پەنا ئەشکەوتێک بدۆزمەوەو بچم ستاری تیا بگرم. لە گەڵ ئەوەش کە نەبوون، کوتوپڕ وەکو دەنگێک بێتە گوێم و لە دەنگی دایکم بکات، وتی دامەنیشەو هەرهاتوچو بکە. منیش ئیتر دەستم کرد بە هاتوچو کردن لە ناو بەفرو کڕێوەکەدا

تا بەیانی. بەیانی ئەم کەڵە کێوەیە سەرما پەکی خستبوو گرتم و سەرم بڕی و ئەوا هاتمەوە».

جا ئیستەش لەو کوێستانانە لە لادێ و شارەکانا، لە ژووری مزگەوتەکانا ئاگر کراوەتەوەو نێڵەنێڵی دێ. پیاوە ریش سپی و دنیا دیدەکان لە بەر ئاگرەکە دانیشتوون و ئەیکەن بە گاڵە، یەکێک ئەڵێ ئیمشەو کوڕی سەبا ئەچێ بۆ کێو، یەکێک ئەڵێ ئیمشەو نیەو سبەی شەوە، بەم جۆرە قسە لە ڕۆیشتنی کوڕی سەباوە ئەکەن بۆ کێو.

## گەلاوێژ

- «گەلاوێژ» لە باوی کوردەکانا، ئەستێرەیەکی زۆر گەشی پڕشنگدارە لە بەینی ڕۆژهەڵات و شیماڵا هەڵدێت. کە ئەم ئەستێرەیە هەڵات، گەرما روو ئەکاتە کزی و بەرەبەرە فێنکی پەیدا ئەبێ و پاشان ئەچێ بە لای سەرماوە.

ئەم ئەستێرەیەش لە شەوی ١٦ی مانگی «مێوەگەنان» -کە بەر شەوی ٦ی ئاب و ١٦ی مورداد ئەکەوێ- لە بورج ئەکەنرێ کەس نایبینێ، بەڵام یەکەم گیانلەبەرێک کە لە پێشا هەستی پێ بکا -بە هەستکردنێکی مەعنەوی- وڵاغی بەرزەیە، ئەسپ و ماین. خاوەنی مەڕو ماڵات -ئەوانەی کە پسپۆرن لە لایەن ئاژەڵداریەوە- کە چاویان بەو وڵاغی بەرزەیە کەوت ئەزانن کە گەلاوێژ لە بورج کەنراوە.

پاش وڵاغی بەرزە، یەکەم گیاندارێک کە گەلاوێژ ببینێ مەڕەکێویە. ئەمە لە بەری بەیانا ئەکاتە سەر کڵاوەو لووتکەی شاخەکانا و بۆ گەلاوێژ ئەگەڕێ تا بەرچاوی ئەکەوێ. مەڕەکێویش کە گەلاوێژی بەرچاو کەوت، ئەکەونە تەگەو بەران.

پاش ئەمانە بەرەبەرە گیانلەبەرەکانی‌تر ئەیبینن. ئاخر گیانلەبەر کە گەلاوێژی لە بەر چاو کەوێ بەرازە. بەراز خۆی لە بینینی گەلاوێژ ئەدزێتەوە، نایەوێ چاوی پێ بکەوێ؛ تا وای لێ دێت تەنانەت لە ئاخرا خۆی ئەکوتێتە شوێنە چاڵەکان و ناو گەرووی قووڵی کێوەکان؛ هەر بۆ ئەوە نەیبینێ. ئەمجا ئەگەر هاتوو گەلاوێژ ئەوەندە بەرز بووەوە کە ئەو لەو شوێنە چاڵەشا هەر بەرچاوی کەوت، ئەو وەختە ئەوانیش ئیتر ئەکەونە با و سواری یەک ئەبن.

## شەکراوی دەماخ

خاوەنی داستانی کوردی وای گێڕاوەتەوە و ئەڵێ:

- جارێک کابرایەک لەو دەشتە سەیری کرد وا شتێکی هەر زۆر زۆر زل لەو دەشتە پێکی لە ڕۆژهەلات و پێکی لە ڕۆژئاوا سەری لە عاسمان توند بووە. دەهۆڵێکی لە ملایە ئەوەندە زلە بە تەواوی بەری ڕۆژی گرتووەو دنیای کردوە بە تاریکستان. دوو مێرکوتی بە دەستەوەیەو دەستی بەرزەوە کردوەو سێ مرەکی لێ وەستاوەتەوە؛ چۆن وەستانەوەیەک؟ وەکوو دەست لە سەر دەم و ئامادەی ئەوەیە کە لە دەهۆڵەکە بدا. کابرا لێی پرسی برا تۆ چیت و ئیشت چییە؟

وتی: «وەڵلا برا من مەلایەکەم؛ لە سەرەتای دنیاوە لێرە وەستاوم بەم دەهۆڵەوە بۆ ئەوە کە ئەگەر مەلایەک شتێکی دا بە یەکێ، لە دەهۆڵەکە بدەم بۆ ئەوە مەلایەکەی ئاسمان و گیانلەبەری سەر زەوی هەموو تێ بگەن».

ئەویش پێی وت: «تو خوا برا تا ئێستا چەند هەزار ملوێن جار لێت داوە؟» وتی: «وەڵلا ئەگەر ئەمە لێدەم، یەک».

- کابرایەک هەبوو لەو دەشتی «قولەو دەکە»یە فەتحولڵای ناو بوو؛ خەڵک پێیان ئەوت: «فەتە». کابرایەکی‌تریش هەبوو ناوی مارف بوو. ئەم دووە هەر دووکیان پیاوی یەکێ لە بەگزادەکانی جاف بوون. مارف بە درێژایی ساڵ فەتەی کردبوو بە گاڵتەچی خۆی و هەر ئەویش زیاتر بە فەتە فەتە، فەتحولڵای کردبوو بە فەتە.

ڕۆژێک پێکەوە دائەنیشن کوتوپڕ مارف ترێکی ناقۆڵا ئەکەنێ، زۆر تەریق ئەبێتەوەو فەتەش نایخاتە رووی. ئیتر لەو وەختە بە دواوە هەر بە دەوری فەتەدا ئەهات و هەموو جار قسەی خۆشی لەگەڵ ئەکرد و بانگی ئەکرد. خەڵکیش لەمە زۆر سەریان سووڕ ئەما و بە جۆرێکی وا ئەمجا ناوی فەتحوڵلا بووبوو بەگاڵتە بۆ فەتە.

ڕۆژێک لە کۆڕێکا دائەنیشن و دیسان فەتحۆڵلاو فەتحۆڵلا بە دەوریا دێت. ئەم ماستاوەشی هەموو بۆ ئەوە ئەکرد کە فەتە باسی تڕەکەی نەگێڕێتەوە. فەتە ئیتر گەیشتە تینی

و وتی: «مارف، مارف! کەم فەتە بکە بە فەتحۆڵلا. بەشم لە هەر چوار مەزەو بڕاوێ عەمینعێلەروتێکت کوتا بە زەویا، دە ئیتر واز بێرە»[18].

- کابرایەک ئیشێکی لە گەڵ ژنێکا لێ قەومابوو، لێی ئاشکرا ببوو. بردیانە لای قازی بۆ ئەوە پرسیاری لێ بکاو بە تۆڵەی خۆی بگەیەنێ. قازی ئەو سەردەمە نووسەرێکی لە بەر دەستا بوو لە کاتی موحاکەمەدا هەر پرسیار و وەڵامێک کە ئەیکرد و وەری ئەگرتەوە، نووسەرەکە ئەینووسی؛ ئێستا پێی ئەڵێن «کاتب زەبت».

جا قازی لە کابرای پرسی: دە ڕۆڵە قسە بکە بزانم چۆن ئەو ئیشەت کرد؟ هەمووی بگێڕەوە. ئەویش وتی: قوربان لای ڕان بوین، هەروا گەمەمان ئەکرد لە پاشا من دەستم کەوتە لای رانی ئەو. ئەویش دەستی کەوتە خوار ناوکی من. وردە وردە پاڵمان دا بە یەکەوە. دەستمان کردە ملی یەک و ماچی یەکمان کردەوە.

ئەوا هەر شتێک ئەم ئەیلێ قازی بە کاتب زەبت ئەڵێ بینووسەو ئەویش سەری شۆڕ کردۆتەوە بە سەر قاقەزاو ئەینووسێ. پاش ئەوە من دەرپێکەم داکەند و ئەویش دەرپێکەی خۆی داکەند. لە دلا زۆر دڵم پێوە بوو، دەستم برد هەر دوو قاچم بەرز کردەوەو چوومە ناو گەلیەوە، کاوراکەی خۆمم گرت و نامە سەر دوا بڕاوەکەی ئەو خۆ...

کە قسەکەی گەیشتە ئەم شوێنە، کابرای «کاتب زەبت» وتی: هە، هە، هە، سە، سە، سەبرکە جارێ ی ی ی» و بە لادا هات و خاو بوەوەو قەڵەمەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە.

- «ئەحەی کڕنوو» هەر لە سولەیمانی پیاوێکی قسە قوت و گاڵتەچی و نوکتەباز بوو؛ چ قسەی چ کردەوەی هەمووی هەر نەستەق بوو؛ ناوبانگی لە هەموو لایە پەیدا کردبوو. ئەو ئیشەی کە بە ناو دەستیەوە بوو شەربەت فرۆشی بوو، بەڵام لە بەر ئەوە لە باری گوزەرانا زۆر ڕێک نەبوو، هەر ئیشێکی بە دەستەوە بهاتایا هەر ئەیکرد. ئەمانەش بۆ نانی فاتە، کەچی نانی فاتە هەر دەست نەئەکەوت.

---

۱۸- عەمین عێلە رووت کابرایەکی چەقۆ ساز بوو لە تەوێلە؛ تەقەی چەکوشی دەنگی ئەدایەوە. دەنگی تەقەی چەکوشەکەی ناوبانگی پەیدا کردبوو.

ئەبێتەوە، مەحمووی نادریش لەسەرخۆ پێی ئەڵێ: «ئینگلیز بەگ! ئیمە دابەستە خزمەت ئەکەین و پاشان سەری ئەبڕین». ئەڵێ کابرای ئینگلیز ئیتر نقەی نەکرد.

- کەریمخانیزەند پێیان ئەوت وەکیلەرۆعایا؛ دادگوستەر و میللەتپەروەر بوو. لە گەرانەکەیا بەوڵاتی کوردەواریدا بیستی پیاوێکی زۆر بەعومر لەدێیەک هەیە، لەبەر تەمەندرێژی هەر لەناو جێگەدا کەوتووە. لەقسەو گوفتوگودا وریا بوو، بەڵام هێزی هەڵسوکەوتی نەمابوو.

وەکیلەرۆعایا ناردی هێنایان و ڕێزێکی زۆری لێگرت و گەڵێ دەنگوباسی کۆنی لێ پرسی. پاشان پێیوت داوای چی ئەکەی بیکە. پیاوەکە وتی: تۆ ناتوانی شت بدەی بەمن. وەکیل وتی: ئەمە قسەیە تۆ ئەیکەی؟ من چۆن ناتوانم شت بدەم بەتۆ؟ وتی: «کە شتت لە دەست دێت جوانیم بۆ بگێڕەوە». وەکیل وتی: ئەمە لە دەست منا نییە. کابرا وتی: «ئەمەت پێ نادرێ بەهەشتم بدەرێ». وتی: ئەمە تۆ داوای چی ئەکەی؟ ئەمەش لەدەست منا نییە. وتی: «کەواتە بمگێڕەوە بۆ شوێنەکەی خۆم».

- مەلاعەبدولڕەحیمیچۆڕستانی لە دێ «فەقێ جنە» [بوو]. مانگی ڕەمەزان، سەرئێوارەیەک لەمزگەوتا دانیشتبوو وەعزی ئەدا ئەیوت: ئەوانەی کەلەم دنیادا چاکە ئەکەن و ئەمرن تۆڵەی چاکەکەیان ئەبیننەوە. هەموو دەمێک چاویان لەوەیە ئەڵێن بریا دەستمان بگەیشتایەتەوە بەخزمو کەسو کار و دۆستەکانمان پێیان بوتنایە ئەوەی ئیمە کردوومانە ئیوەش بیکەن. هەروەها ئەوانیش کە لە دنیادا خراپە ئەکەن، پاش مردن تۆڵەی خراپەکەیان ئەبیننەوە. ئەوانیش ئەڵێن بریا دەستمان بگەیشتایەتە دۆستو کەسو کارەکانمان پێیان بوتنایە ئەوەی ئیمەکردوومانە ئیوە ئەوە مەکەن.

حەسەنبەگیقادربەگیجاف کە مەلای ئەوێ بوو، ئەویش لە وەعزەکەدا بوو هەڵیدایە وتی: «مامۆستا! کەواتە لەو دنیاش ڕەحەتی هەر نییە؛ چونکە ئەوەی چاکە بکا و خراپە بکا هەر تووشی ئەو مەراقە ئەبێ لەوێدا کە بڵێ بگەڕایامەوە دنیا بۆ ئەوە کەسوکارەکەم تێ بگەیەنم. دەی ئەمە کەی وایە کە ئیوە بێژن لەبەهەشتا هیچ خراوەیەک و دەردەدڵیەک نییە. دەسا وەقەورەکەی حەمەپاشا خوا ئەمە فتنەیە دروستی کردگە، فتنە».

– مەلایەک هەبوو لەو ولاتی بادینانە، لە سەرمایەی دنیا تاقە کەرێکی شینی هەبوو. بەرەڵای ئاوایی ئەکردو بەر ئەبووە دەغڵ و دانی ئەو عالەمەو لەبەر ئەوەش کە کەری مامۆستابوو، کەس نەیئەویرا دەنگی لەگەڵ بکا. وای لێهاتبوو گیپەرەی ملی باوەشی پیا نەئەهاتەوە. تەنانەت نەوەک زەلام، کەری گوندیش هەر پێیان نەئەویرا.

رۆژێک کەری مەلا لەگەڵ کەری کابرایەکی‌تر کە ناوی سۆفی‌قادر ئەبێ، ئەبێ بە شەڕیانو کەری مەلا بەجووتە، کەری کابرا ئەتۆپێنێ. کابراش تەنها هەر ئەو گوێدرێژەی هەبوو کە بە کاروان و شتەپیوەی بەڕیوە ئەچوو.

خەمی لێ هات کەچی بکا. وتی ئەگەر ئیستە ئەچم و ئەڵێم مەلا کەری تۆ کەری منی تۆپاندووە هیچم ناداتێ. نەوەڵلا چاک وایە لە پێشا بڵێم کەری من کەری تۆی تۆپاندووە. ئەو وەختەبە شەرع ئەیخاتەسەرم و کە بیبژێرم. پاش ئەوە من هەر بە شەرعەکەی خۆی کەری خۆمی پێ ئەبژێرم و هیچی پێ ناکرێ.

هەستا چوو وتی مامۆستا کەرەکەی جەنابت لەناو قەرسیلەکەدا بوو. منیش کەرێکم هەبوو ئەویش چوو بوو بۆ لەوەڕ. لەناو قەرسیلەکەدا بوو بەشەڕیان و قەزا و قەدەری وای هانی کە کەرەکەی من دای لە هێنەکەی جەنابت و تۆپانی. ئیستە ئەوا هاتوومەتە خزمەتت بزانم چی ئەفەرمووی؟

مەلا کە گوێی لەمە بوو، تووڕە بوو وتی چۆن تۆ کەری من ئەتۆپێنی و هەروا بە هیچ بڕوا؟ شەرع ئەفەرمووی ئەبێ بیبژێری.

سۆفی قادر وتی: قوربان لەکام کتێبا وا ئەفەرموێ ئیمە موسلمانین و بەپێی شەرع ئەبزوینەوە، چی ئەو بفەرموێ نابێ لێی لاڕێ بین.

مەلا ئەمەی زۆر پێ خۆش بوو وتی: باوکم لە «ئەنواری مەزنێ»دا وا ئەفەرموێ و پەلاماری ئەنواری مەزنێ دا. سۆفی قادر وتی قوربان دیارە بۆم ئەخوێنیتەوە. مەلا وتی: بەڵێ، بەڵێ بۆت ئەخوێنمەوە. شەرع گەورەیە نابێ لێی دەرچین. دەستی برد عەینەکەکەی هەڵگرت و تەلەکانی کە لار بوو بوو، تۆزێ راستی کردنەوەو خستیەبەر چاوی و کتێبی لە بەر دەمی خۆیا دانا و دەستی پێ کرد. سۆفی وتی قوربان ئەبێ مانعاشم بۆ لێ دەیتەوە؛ ئەگەینا تێناگەم. وتی: بەڵێ چۆن مانعات بۆ لێ نادەمەوە. ئەوەتە ئەفەرموێ: «ابجد» جووتە کەرا جوت بین جوت «هوز» هەوەسانیان هەستا، «حطی» هەمی هەوی خست بە شیوەی بادینان، «کلمن» کەلەمەکەی بە زکی کەوت هەر بەشێوەی بادینان، «سعفل» کەری

فسررفسێ کرد، «قرشت» سکی شەقی برد و قیرانی، «ئخرِ» کەوتە خیزەخیز و گیزەگیز، «قظغ، فتبارک اللّه احسن الخالقین» زوو بینە هەقی کەرێ شین.

ئەمجا سۆفیقادر وتی دەبەخوای مامۆستا کەری تۆ کەری منی تۆپاندیە؛ بینە هەقم. مامۆستا تۆزێ راما و وتی: «ابن حجر»انیش هەیە، بزانم لەوا چ دەفەرموێ. «ابن حجر»ی هێنایە پیشەوەو دەستی کرد بەخوێندنەوەی و وتی: «لولاک لولاک لما خلقت الافلاک سبوح قدوس، سبوح قدوس ربنا ما خلقت هرا باطلا». کورِم مانعاکەشی ئەمەیە: «کەری مەلا لەکۆلانان لە ناو قەرسیل و ناو لۆیان ئەگەر خولقیان تێک داو خستیانە فەلاکەتەوە لەسەر سبەینان لەقەی هاویشت و بەقەدەر دای لەکەری سۆفی قادری رێبوار و خەلقی گوندان با برِین هەزاران باتمان لە هوونیەتی «ربنا ما خلقت هرا باطلا». هیچت ناکەوێ و هەستە بچۆ بەولا».

سۆفی هەناسە سارد دەست لەگونان بەرەو ژێرتر بە رێگەی خۆیا گەرِایەوە.

– لەدەوری «فەرا میرزا» دا لە سنە کورێکی زاخەیی لەسەر دزی گیرا بوو. فەرا میرزا فەرمانی خنکاندنی دەرکردبوو. رۆژێکیان بۆ خنکاندنەکەی دانابوو، لەو رۆژەدا لەبەر «دەرمال» سێدارەیان بۆ هەلخستبوو. کورِەیان هێنا بۆ ژێر سێدارە. دایکەپیرێکی هەبوو ئەویش هاتبوو بۆ سەر سێدارەکەو بەگریان و زاری بۆ کورِەکەی دلی ئەو عالەمەی کردبوو بە کەباب.

فەرا میرزاش لەسەر تەلارەکەوە سەیری خنکاندنی کورِەکەی ئەکرد. کورِە کە چاوی بەدایکی کەوت، سەری بەرز کردەوە بۆ لای فەرا میرزا و وتی: شازادە تاقە ئاواتێکم هەیە لە سەرەمەرگا بەجێی بێنە. فەرا میرزا وتی: داوای چی ئەکا بۆی جێبەجێ کەن. کورِەوتی: «ئاواتم ئەوەیە، ئا ئەوە دایکمە، منی بەخێو کردوەو شەونخوونی بەدیارەوەکێشاوم. رێگەی بدەن بێتە لام دەستێک ئەکەمە ملی و هیچیتر».

دایکەیان بردەلایەوە دەستی کردە ملی کورِەکەی و ئەویش دەستی کردە ملی ئەو وتی: «دایە، ئەمە ئاخر چاو پێکەوتنمە. زمانت دەربێنە با ماچێکی بکەم». دایکەکەی زمانی دەرهێنا و کورِە دەمی نزیک کردەوەو زمانی برد بە دەماو لە بنا زمانی قرتان.

دایکە خەلتانی خوێن بوو، لەوێ کەوت. فەرا میرزا ئەم ئیشەی زۆر بەلاوە سەیر بوو وتی ئا بۆم بێنن، بزانن بۆچ لەو وەختەدا وای بەم دایکەی خۆی کرد؟ کورِەیان برد و لێی

پرسی. کوڕەوتی: «شازادە! ئا ئەم سێدارەیە کە بۆ من هەڵخراوە، ئەمە ئەم دایکەم بۆی هەڵخستووم».

فەرا میرزا بەسەرسامیەکەوە پرسی چۆن؟ وتی: «شازادە! من مناڵ بووم، ڕۆژێک چووم لە ماڵە دراوسێیەک هیلکەیەکم دزی و هێنامەوە. دایکم لێی پرسیم ئەمەت لەکوێ بوو؟ وتم لەو ماڵەم دزی. گەلێ بە دەورما هات و پێی خۆش بوو وتی رۆڵە بچۆ هیتریش بدزە. ئیتر هەموو رۆژ ئەچووم هیلکەم ئەدزی. پاش ماوەیەکی زۆر ئەمجا ئەچووم مریشکم ئەدزی و ئەمهێنایەوە بۆی. پاش ئەوە ئەچووم شتیترم ئەدزی و لە ئاخرا وام لێ هات کار و فرمانم بوو بە دزی و ریگری. تا رۆژم بوو بەو رۆژە ئەگەر هەوەڵجار ئەو سەرزەنشتی بکردمایەو پێی بووتمایە شتی وا مەکە، خراپە، بۆچی تووشم ئەبوو بە تووشی ئەم رۆژە رەشەوە؟ کەواتە راستە ئەو سێدارەکەی بۆ هەڵخستووم. ئیستەش منیش هیچم لە دەست نایە لەم وەختەدا تەنها ئەوە نەبێ ئەو زمانەی کە منی هان دا بۆ دزی بیبرم و تۆڵەی خۆم بسێنمەوە.

فەرا میرزا کەگوێی لەقسەکەی بوو، بەقسەیەکی گەورە هاتە بەرچاوی. لەکوڕەکە خۆش بوو فەرمانیدا سێدارەکەیان هەڵگرت.

– کوڕیک لەو ناو «مەرگە»یە چاویکی کوێر بوو. سەرەی ژن هێنانی هاتبوو. ئەچوون داوای هەر کچێکیان بۆ ئەکرد، هەر چەندە یەک چاوی بۆ پیاو عەیب نییە، بەڵام تۆزێ لە دانی کچەکە خزم و کەس و کارەکەی سڵیان ئەکردەوە.

کوڕەکە دایکیکی هەبوو؛ رۆژێک پێکەوە لە ژوورەوە دانیشتبوون. کوڕەکە رووی تێکرد و وتی: «ئەرێ دایە، تۆ خوا ئەم چاوەی من بۆچ کوێر بووە؟» دایکیشی وتی: «رۆڵە، ئەوە مناڵ بویت سوژنێکت گرتبوو بەدەستەوە. هاتم لەدەستتم وەرگرتەوە تۆیش دەستت کرد بە گریان دامەوە بە دەستەوە. پاشان کردت بەچاوی خۆتا-دایکت بمرێ!- ئەو چاوەت وا کوێر بوو».

کوڕە تۆزێ سەری داخست و پاشان سەری بەرز کردەوەو وتی: «دایە، گوایە تا ئیستەش هەر ئەگریام؟ ئەمەچی بوو تۆ بەسەر منت هێنا؟» بەخوا لێی راست بووەو ئەوەندەی حەو کەری تۆپان.

- لەو ولاتی بلباسەتیە کابرایەک هەبوو ناوی مامباپیر بوو. رۆژێک مەلای ئاواییەکەیان بانگ ئەکا و پێی ئەڵێ: «مامۆستا من مووچەت ئەدەمێ و من بەخێوت ئەکەم، کەچی تۆ رۆژی جومعە دوعا بۆ سولتان عەبدولحەمید پادشای عوسمانی ئەکەی. ئەگەر دوعا بۆ منیش ئەکەی باشەو ساڵێ ۳۰ سەر حەیوانیشت ئەدەمێ؛ خۆ ئەگەر نایکەی هەر لە ئیستاوە جێگایەک بۆ خۆت بدۆزەرەوە. مەلا وتی زۆر باشە، تۆ ئەوەندە شتم بدەیتی من چۆن ئەبێ دوعات بۆ نەکەم».

رۆژی هەینی هات و مەلا خوتبەی خوێند و لەپاش دوعا بۆ پادشای عوسمانی وتی: «یا ایهاالمام باپیر. انک لدب کبیر فمکانک بئس المسیر، واللّهکل شئ قدیر».

کابرایەکی خوێندەوار بەرێکەوت لەوێ بوو، سەری هەڵبڕی کە بڵێ مەلا چیت وت، مەلا وتی: «اسکت اسکت اسکتون. هرا قوم حمارونها عطی غنم سلاسون عشرلک ولی عشرون». کابرا ئیتر هیچ دەنگی نەکرد، لەپاشا مام باپیر زۆر زۆر مەلای خۆش ئەویست و خزمەتی ئەکرد.

## زۆر دوو

- ولاتی بانە ئاغە رووتەی زۆری هەیە. بایزاغا هەبوو لەگوندی «بلەسەن» شوانی ئاواییەکەی ئەکرد. ئێوارەیەک پیرەژنێک ملی ئەگرێ و ئەڵێ: «بایزاغا» مەڕەپەرەکەمان نەهاتۆتەوە. ئەویش ئەڵێ: «نەهاتۆتەوە قیروسیا! جا وەرە شوانی بکە بۆ مسکینی کەرانباو گاو».

کابرایەکی سەرشیوی لەوێ ئەبێ، ئەڵێ ئاغا بۆچی تۆ شوانی ئاواییەکەیت؟ ئەویش ئەڵێ: «کورە نەوەڵلا هەر ئەوەندەیە بە رۆژ رانەکەیان بۆ ئەبەم بۆ لەوەڕ. مسکینی کەرانباو گاو چ رایەی ئەیان ئەکەوێ من شوانیان بۆ بکەم».

- ئینگلیز تازە هاتبوونە عێراقەوە،جارێک دوو کەسیان لە بناری هەڵەبجە ئەچن بۆ راو. بە دەم گەڕانەوە رێیان ئەکەوێتە گۆی چەمێک. لەوێ دوو شوانی کوردیان لێ پەیدا ئەبێ. بەشتێکی سەیریان ئەزانن رووتیان ئەکەنەوەو تیرو پریشیان لێ ئەدەن.

ئینگلیزەکان ئەچنەوە بۆ بەغداو شکات ئەکەن و بەناو نیشان دوو کوڕەکە ئەدۆزنەوەو ئەیانبەن بۆ بەغدا. لەبەرانبەر حاکمەوە رایان ئەگرن. ئەمانیش زمان نازانن، دیلماجێکیان بۆ دێنن.

حاکم لێیان ئەپرسێ کە بۆچی لەو ئینگلیزانەتان داوە؟ کوڕەکان یەکێکیان روو ئەکاتە ئەویکەیان و ئەڵێ: «ئەری حەمک! ئەوە ئەم هەفمە یێژی چی؟» لەپاش ئەوەکە تێیان ئەگەینن، هەر ئەوەیان روو ئەکاتە حەمک و ئەڵێ: «کورەحەمک! ئەوە ئەو سوور سوورەکەی پار نیژن کە لە گویی ئاوەکەی "پریس" گرتمانن تیر و پرمان لێیان دا؟» حەمکیش ئەڵێ: «تۆ بێژی ئەوە بێژن؟» ئینجا هەر ئەوەیان لێوێک لەحاکمەکە هەڵئەقرتێنێ و ئەڵێ: «ئۆ خۆزگەت پی نەوێ و بەردی تۆی لێ نەوارێ! قسەی پار ئەگێرێتەوە». لە پاشا کە بەم جۆرەیان ئەیانبینن بەرەلایان ئەکەن.

- کابرایەکی قووچی سنەیی ریی ئەکەوێتە «پشدەر» و ئەچێتە دیوەخانی رەشەی ئەولاغا. ئاغە لێی ئەپرسێ برا ناوت چیە؟ ئەویش ئەڵێ: «نۆکەری گەوران، غولامی سەری خانی خانان، ئاغا میرزا حەسەن خانی مورتوزا قولیخانی میراخورزادەی کەمەربەندەی سەرجوقە». ئاغە بەئەسپایی لەشوێنەکەی خۆی راست ئەبێتەوەو ئەچێ بۆ نوێژو روو ئەکاتە کابراوە پێی ئەڵێ: «کابرا تا دێمەوە ناوی خۆت کورت نەکەیتەوە کورتت ئەکەمەوە». ئەچێ دێتەوە لێی ئەپرسێتەوە کابرا ناوت چیە؟ ئەویش خێرا ئەڵێ: «قوربان! حسە».

- حاجی مەلا رەسولی دیلێژەیی، مەلا ئەحمەدی کوڕی لە سولەیمانی هەڵهاتبوو. لە پاش ماوەیەک شەو لە ناوێک بەدزیەوە هاتبووەوە.

ئینجا مەلا رەسووڵ هەر بەو شەوە ئەچوو بە گەڕەکەکەوە ئەسووڕایەوە، هەر کەس تووشی ئەبوو ئەیووت: «تۆیش وەکو ئەحمەدی کورم وایتە، ئەحمەد هاتۆتەوە دەنگ مەکە». عەساکەشی درێژ ئەکردەوەو ئەیوت: «رووسێکیشی کوشتووە». ئەو شەوە تا کەوتە بەیانی خۆی هەموو کەسێکی تێگەیاند و بە هەموو کەسیشی ئەوت دەنگ مەکە. بەیانی کە رۆژ بووەوە لە سەر دەمشرێ حاجی مەلا هاتن مەلا ئەحمەدیان گرت.

- مەلاجەلالیموعز کوڕێکی هەبوو ناوی حەمەحەسەن بوو. رۆژێک ئەچێ بەسەریا سەیر ئەکا وا حەمەحەسەن گوێزان (موشین) ئەکا. لەو کاتەدا کە ئەم ئەچێ حەمەحەسەن

پلەکەی ئەهاوێژێ و ئەڵێ: «سەرو میش و حەج»[١٩]. مەلاجەلال ئەیگرێ تێروپڕ ئەیکوتێ. خەڵکی دێن لە ژێر چنگی دەریدێنن و پێی ئەڵێن: مامۆستا بەسیەتی ئیتر وازی لێ بێنە. ئەویش سوور ئەبێتەوەو ئەڵێ: «ئاخر من بە لای خۆمەوە مەلاجەلالم پێ ئێژن؛ چۆن ئەبێ حەمەحەسەنی کوڕی من بێژێ سەرو مێشو حەج».

- شێخێک رۆژێک لە شارەوە ئەچێتەوە بۆ ماڵی خۆیان. لەرێگا چەند ماڵێکی کورد هەڵیاندابوو. لا ئەداتە ناویان. ژنێکی خێڵەکە -کەدەروێشی خۆی بوو- چاوی پێ ئەکەوێ ئەوا شێخ جەمەدانەیەکی تازەی کڕیوەو خستویەتە ملی. روو ئەکاتە خەڵکەکەو ئەڵێ: «ماشەڵلا ماشەڵلا، تەماشا کەن شێخ بەو جەمەدانەوە کە لە ملیایە چەند جوانە. ئێژی گویرەکە سووری ئێمەیە کە گویرەوساری تازەم کردگەسە ملی».

- مەلایەک لەمانگی شەواڵدا وەعزی ئەدا ئەیوت: رۆژووی شەشەلان خێری ئەمەیەو ئەوەیە. کابرایەکی کورد راست بووەوەو وتی: «مەلا! مەلا ببورەوە! بیبوڕەوە کەسی دایکیان نەگاوی، رەمەزانی لەبیر نەچوەتەوە، ئینجا نۆرەی شەشەلانە».

- خەلیفەیەکی گژن ئەچێتە گوندێک، پیرەژنێکی هەژاری لێ ئەبێ دەروێشی خەلیفە ئەبێ. ئەچێتە پێشوازی و ئەیهێنێتەوە بۆ ماڵەوە. خەلیفە لە پاش تۆزێ حەسانەوە ئەڵێ: ئەچم بۆ مزگەوت نوێژەکەی نیوەڕۆم ئەکەم و ئەگەڕێمەوە. ئەویش ئەڵێ باشە بە قوربانت بم! منیش تەنها دوو هێلکە شک ئەبەم، بۆت ئەکەمە ناو رۆنەوە. کە هاتیتەوە بێقڕە بیخۆ.

خەلیفە ئەچێ و نوێژ ئەکاو ئەگەڕێتەوە. لەو لاوە دەروێش شوێنی ئەکەون. ئەویش تووشی هەر کەس ئەبێ ئەڵێ با بچینەوە بۆ ماڵەوە. بە دە پانزە کەسێکەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. کە پیرەژن چاوی پێئەکەوێ وا خەلیفە ئەم لەشکرەی لەگەڵ خۆ هێناوە، هەر دوو چاوی ئەپەڕێتە تەوقە سەری و لەداخا هیچی پێ نامێنێ. وا رێکەوتبوو شوێنەکەش رووەو رۆژ بوو. دەستێک ئەخاتە سەرچاوی بۆ ئەوە باش بۆی دەرکەوێ کە ئایا ئەم لەشکرە

---

١٩- لەم یاریەدا سێ گوێز ئیش ئەکا: یەکێکیان ئەوەیە کە یاریکەرەکە بە دەستیەوەو پلەکەی پی ئەهاوێژێ؛ ئەمەیان پێی ئەڵێن «سەرە». ئەوانیتریش کەبە ریز دانراون، هی هەرە پێشوویان پیی ئەڵێن «میش»، هی هەرە دواییان ناوی «حەج»ە. جا ئەو کەسە کە پلەکە ئەهاوێژێ لەوەختی هاویشتنیا ئەگەر وتی: «سەر و میش و حەج» ئیتر ئەو سەرەیە بەر هەر گوێزێ بکەوێ، ئەیخوا.

خەلیفەیە یان نە. بۆی ساغ ئەبێتەوە کە خەلیفەیە، لەم قسەیەزیاتر هیچی بۆ نایە کە ئەڵێ: «گژگژ، خەلیفەبەکەلە! گژگژ خەلیفە بە کەلە!»

- سی چوار فەقێ بە دەقنەو راتو پارە کۆ ئەکەنەوە. هەریەکە دەستێ جلی تازە لەبەر ئەکەن و بۆ خوێندن ئەڕۆن کە بچن بۆ موکریان. ڕێیان ئەکەوێتە گوندێکی مەنگوڕایەتی؛ لە ماڵێک دائەنیشن. کابرایەکی خەڵکی دێ چاوی پێیان ئەکەوێ ئەپرسێ ئەمانە چین؟ ئەڵێن مەلا و فەقێن. کابرا ئەڵێ: «عاشیرەت تەماشا کەن چەن خاوێنن؛ ئەڵێی سەگی دوای مەڕن».

- کابرایەکی کورد چوو لە زەویەکدا دوو مەن هەرزنی چاند و وتی ئەمە نانی ئیمسالم. بۆ نەگبەتی بارانێکی زۆر باری، لافاو هەستا و هەموو هەرزنەکەی برد. کەکابراکە هاتوو سەیری کرد هەرزن نەماوە، دەستی دایە «قۆچەقانێ»و چووە سەر بەرزاییەک گەلی بەردی بۆ ئاسمان هاویشت.

پیاوێکی ژیر چاوی لێبوو؛ بۆ شەوێ چوو جووتی خۆی سی مەن گەنمی لەجێ هەرزنەکە چاند. لەدوای چەند رۆژێک ناردیە لای کابرای خاوەن هەرزن وتی بێت تەماشای بکا هەرزنەکەی رواوە. کەکابرا چوو سەیری کرد لەباتی گاڵ گەنم رواوە. رووی کردە ئاسمان وتی: «ها برا! هەتا شەقەی قەڵماسکت نەدی، گاڵت نەکرد وەگەنم».

- کابرایەک ناوی حەمەمراد ئەبێ، شایەر ئەبێ، حەقایەتخوان ئەبێ. لەگەڵ «قەیتولی» کوری لالەسەرحەددا برایەتیان زۆر خۆش ئەبێ. قەیتوولی ئەمرێ و حەمەمراد بەشیوەن و باوکەڕۆ ئەچی بۆ سەر تەرمەکەی. لالەسەرحەد ئەو سەردەمە مابوو، بەڵام چاوی کوێر بووبوو. کە دەنگی هۆرەی حەمەمراد ئەبیەت ئەڵێ: عەشیرەت ئەوە من بزانم دەنگ دەنگی حەمەمرادە؟ ئەڵێن: ئەرێ بەخوا ئەوە باوکەڕۆ ئەکا. لالەسەرحەد بەیەکی لەکورەکانی ئەڵێ: ئا تفەنگێکم بۆ بیرە. ئەڵێ بۆچیتە؟ ئەڵێ: «چلۆن قەیتولی مردوێ و حەمەمراوێ دویت باوک ماوێ! وەو سەیساقە ئەگەر دەسی وەدەس خواوە وێ تۆی بیکوژم». ئیتر خەڵکەکە پاڵێ بەحەمەمرادەوە ئەنێن و دەربازی ئەکەن.

- کابرایەکی کۆنەفرۆش هەبوو لەسولەیمانی «سەعۆل»ی ناو بوو. بەناو شارا ئەسووڕایەوە بانگی ئەکرد: «کەوا کۆن، کراسەکۆن، سەڵتەکۆن،ماڵی دەمارە توتنی بێ دەمار».

ئیوارەیەک نوێژی شێوان لە مزگەوتی مەلکەندی نوێژی بەجەماعەت ئەکرد؛ کە نیەتی دابەست لەباتی ئەوە بڵێت «اللّه اکبر» بەدەنگیکی قایم وتی «کەوا کۆن». خەڵکەکە هەموو دەستیان کرد بەپێکەنین و نوێژەکەیان بڕی و وتیان ئەمەچی بوو؟ وتی: «بەخوا لام وا بوو لە بەر ماڵی مینا خانمام».

- دوو زەلامی مەریوانی چوون بۆ گەرمیان، بوون بەسەپان. گەرما بوو، رۆژێک نانی گەنمیان بە دۆوە ئەخوارد. دۆیە کە زۆر کەم بوو؛ یەکێکیان وتی: «ئاخ بۆ ئاوە ساردەکە، تۆ خوا ئیستاکە چی خۆشە؟» ئەویتر وتی: «بەمن ئێستا لە کانی خەیاران پڕ کۆشم لەنانی هەرزن بوایە. لەدەستما وردم بکردایە بە قوڕگما و بەلوێچ و لەو ئاوە ساردەم بکردایە بە سەریا». ئەویتر وتی: «دەک ماڵت بەقوڕ گیرێ! وەڵلا هیچ شتێکت بۆ من نەهێشتەوە کە باسی بکەم».

- وەختی خۆی چای وا زۆر نەبوو. رۆژێک دوو زەلامی شارەزووری ئەچنە شار تێر نان و کەباب ئەخۆن و پاشان ئەچنە چایخانەیەک-وا ئەزانن شەربەتخانەیە-چایچی دوو چایان بۆ ئەبا. کە ئەیخۆنەوە یەکێکیان ئەڵێ: بەخوا گەرمە. ئەوە بۆچی وایە؟ هاوڕێیەکەی ئەڵێ: «ئێستا کولاندگیانە، هێشتا بەفریان تێ نەخستگە».

لە دوای ئەمە تۆزێک یەکێکیان دەست ئەبا و دوو پوڵ ئەدا بەچایچیەکە، چایچی ئەڵێ: خزمە هەر پیاڵەیە دوو پوولە؛ کەچی بەدوو پیاڵە دوو پوولم ئەدەیتێ؟» کابرا هاواری ئەکرد: «خەڵکینە! تەماشای ئەم کاورایە کەن چەند بێ ئینسافە. حاجی ئەحەی‌کرنو بەو پیاڵە زلانە پریشی لە بەفر ئەکا ئەیدا بەپوولێک؛ کەچی ئەم پیاوە بەو پیاڵە بچکۆلانەیە داوای یەکێ دوو پوول ئەکا. ئەوەندەش گەرم بوو هەموو دگانمان سووتا».

- حاجی‌شێخ‌مستەفای‌محەمەد هەبوو لەسولەیمانی وتی: مەلا مەحمودێک دراوسێمان بوو، هەر چەند تووشم بهاتایە ئەیوت: مەرحەبا شێخ ئەولا. منیش رۆژێک وتم: مامۆستا من ناوم مستەفایە، ناوم شێخ‌ئەولا نیە. وتی: «ها باشە». لە دوای یەک دوو رۆژیتر لەسەر رێگا

دیسانەوە تووشم بووەوە وتی: مەرحەبا شێخ‌ئەولا. وتم مامۆستا چەندجار عەرزم کردیت ناوم مستەفایە، شێخ ئەلا نیە. وتی: «سا وەڵلا وامزانی ناوت شێخ رەسوولە». منیش وتم هەی دەستت بەگونم.

- کابرایەک بوو بە میوانی کابرایەکی کورد. کابرای خانەخوێ لە گەڵ ژنەکەی بوو بەشەڕیان. گوێ ئاگردان بوو بەسەرە بزۆت دانرابوو. ژنەکە هەر کردی بە سەرەبزوتێکاو لە بەر چاوی میوانەکەوە دای بەسەری مێردەکەیا و سەری شکاند و خوێن چۆڕاوگەی کرد. کابرای میوان بۆ ئەوە خانەخوێکە زۆر تەریق نەبێتەوە وتی: «برا وەڵلا ژنی ئیوە باشە بە سەرەبزۆت لەکۆڵتان ئەبنەوە؛ ژنی ئیمە بە تەورو تەوراس تێمان بەر ئەبن». کابرای خانەخوێ لەو وەختەدا دەستی برد بەلایەکی پەنجەی خوێنەکەی لە ناوچەوانی سڕیەوەو وتی: «ژنی ئێمە حەقیان چیە وا لەگەڵ ئێمە بکەن».

- مەحمووی ووردەشاتری کچێکی هەبوو ئەیدا بە مێرد. روویان کردە مەحموو کە قسە بکا. ئەحەی نادری هەلاجیش هەبوو، هەڵیدایە وتی: «برا خاڵەمەحموو بەریشی سپیەوە دەمی خۆی گلاو ناکا، کوڕی هەس با ئەو قسەبکا».

- کابرایەک ئەچێتە سولەیمانی بەبەر دوکانی پینەچیەکدا تیئەپەڕێ. مەرکانەی دەستاوەکە دانرابوو، دڵی لێ ئەچێ و پێی ئەڵێ: «خاڵو بکێشە بایی قرانیک لەو دۆشاوە». ئەویش گلینەکەی بۆ پڕ ئەکا ئەیداتێ. کابرا ئەینێ بەسەرەوە هەمووی ئەخواتەوەو لەپاشا پێی ئەڵێ: «خاڵو نەبژی کوردە خەشیم و نەیزانی، دۆشاوەکە دۆشاویکی خاس بوو وەلی چکێ تفت بوو».

- کابرایەک هەبوو حەسەناغای ناو بوو. جارێک لەکەندەلانێکا ماینێک ئەگێت. ئەچن بە سەریا و پێی ئەزانن، ئەویش لەشەرما روو ناکاتەوە ئاوایی، سەری خۆی هەڵئەگرێ و روو ئەکاتە ولاتان.

چەند سالێکی پێ ئەچێ کابرایەکی لای خۆیانی بەرچاو ئەکەوێت؛ بەلام ئەو ئەم ناناسیت. ئەچێ بە لایەوە لێی ئەپرسێ: «برا دەنگ و باسی ولاتی لای ئێوەچییە؟» کابراش ئەڵێ: وەکوو چی؟ ئەڵێ چووزانم هەروا، حەسەناغایەک کەندەلانی، ماینیک، شتیک! ئەڵێ:

«وەڵلا برا ئاگام لە هیچ نیە؛ چونکە لەو ساڵەوەکە حەسەناغا ماینەکەی لەکەندەڵان گاوە، من لەوێ دەرچووم ئیتر نازانم».

حەسەناغای هەزار لە دڵی خۆیا ئەڵێ: «دەک مبارەک نەبێ! خۆ ئەمەبووبە تاریخیش». ئیتر تا مرد رووی نەکردەوە بە وڵاتا.

- حاجی ئیلخانیدیبۆکری ئەچێ بۆ سابلاخ. «ئەحمەدەکەلە» چەند خزمەتکاریکی تری لە گەڵ ئەبێ. هەر جارە کە بچوایە بۆ شوێنێک خزمەتکارێک ئەبوو بە کیسەدارو ئەبوایە پرسیشی بەحاجی ئیلخانی بکردایە کەچی ئەخوا. ئەم جارە ئەحمەدەکەلە بوو بەکیسەدارو مەسرەفچی و ئەم رەوشتەی حاجی ئیلخانیشی نەئەزانی.

رۆژێک لێی ئەپرسێ ئەڵێ: ئاغە ئیوارێ چی ئەخۆی؟ ئەویش بە توورەییەکەوە تەماشای ئەکا و ئەڵێ: «گوو ئەخۆم». کابرا لە پاشا تێ ئەگەیەنن کە تەبیعەتی حاجی ئیلخانی وایە. واقی وڕ ئەمێنێ. ئەگەر نایهێنێ ئەزانێ بەبێ شک ئەیکوژێ، ئەگەر ئەشیهێنێ هەر ناکرێ. ناچار ئەچێتە بازاڕ هەندێ کوولەکەی گەنیو ئەکڕێ و سووری ئەکاتەوە. ئیوارە لە گەڵ شتیترا دایئەنێتە بەردەستی. حاجیش سەیریکی ئەحمەد ئەکاو پارویک لە کولەکە بۆگەنەکە ئەخواو ئەڵێ: «گێلە بەگوێشم ئەکا گووم بۆ دینێت. دەلایبەن لایبەن». ئیتر ئەحمەد بەو جۆرە خۆی لەکوشتن رزگار ئەکا.

- «عێزەتیتەل» لەسولەیمانی لیرەیەکی دابوو بە «عەلیەتورکە» بیبا بۆی ورد کاتەوە. ئەویش ئەڕوا ون ئەبێ. لە پاش چوار رۆژ عێزەت چاوی پێی ئەکەوێتەوە ئەڵێ: عەلی کوا لیرەکە؟ ئەویش ئەڵێ: «ئەمە سێ رۆژە بە شوێنتا ئەسووڕێمەوە؛ وەرە تا حسابەکەت بدەمێ». عێزەتیش ئەڵێ: عەلی حسابی چی؟ لیرەم پێ داوی بۆم ورد کەیتەوە، ئیتر حسابی چی پێ ئەوی؟ ئەڵێ: «ئاخر بێقەزا بی! تۆ سەبرکە، هەر ئەو رۆژە چووم بۆم ورد کەنەوە شەش تارانیم لێ دا بەکەباب خواردم». ئەویش ئەڵێ: باشە باقیەکەی بێنە. ئەڵێ: «بێ قەزابێ! ئاخر سەبرکە تا حسابەکەت بدەمێ». هەژدە تارانیشم دا بە جووتی کەوش لە پێم کرد. ئەڵێ: باشە ئەویتری بێنە. ئەڵێ: «ئاخر قوربان تۆ تۆزێ ئارام بگرە هەتا بە پوختی حسابەکەت بدەمێ». ئەڵێ: کورەغەزەبی خوا حسابی چی؟ من کەی حسابم لە گەڵ تۆ هەیە. لیرەم پێ داوی بۆم ورد کەیتەوە، ئیتر چ حسابێک هەیە؟ عەلیش ئەڵێ: «هۆهۆ بێ قەزابی! تۆ گوێ بۆ پیاو راناگری».

عێزەتیش ئەڵێ: ئادەی فەرموو. ئەویش ئەڵێ: «ئەی ئەمە سێ ڕۆژیشە بە شوێنتا ئەسووڕێمەوە بۆ ئەوە باقیەکەت بدەمێ، ئاخر نالێیت بەچی ژیاوە؟ لەم سێ ڕۆژەدا خۆ گووم نەخواردووە؛ ئەویتریشم خەرج کرد. ئەوا ئێستە بەرچاوم کەوتی، هیچ نەما بتدەمێ. من ئەڵێم سەبرکە با حسابەکەت بدەمێ -سەلامەت بی!- تۆ هەروا لە هەموو شتێکا بە پەلەی».

عێزەتیش ئەڵێ: «دەک رووت رەش بێ بۆ خۆت و بۆ لیرەیەک کە بۆت ورد کردمەوە».

قسە دێ قسە ئەبڕێ، ئەم عەلیەتورکەیە پۆستەچی بوو لەتەلخانە لە بەر دەستی عێزەتا.

- جارێک باسی پیاوی «ئێختیار» و بە عومر ئەکرا، کاک ئەولای عەزیزی هەمەوەن گێڕایەوە وتی: جارێک لە «ئەدەنە» ڕێمان کەوتە دێیەک کابرایەکی ریش ماش و برنج لە بەردەمی مزگەوتەکەدا ئەگریا. لێمان پرسی بۆچ ئەگری؟ وتی: باوکم لێی داوم. ئێمەش وتمان سەیرە، بابچین بۆ لای باوکی ئەم کابرایەو کابرامان برد و چوینەماڵەکەیان. راست بوو، پیاوێکی پیر دانیشتبوو. لێمان پرسی بۆچی لەم کوڕەی خۆتت داوە؟ وتی: «قوربان ئەم ناجنسە بێئەدەبە؛ ئەمڕۆ چووە دڵی باوکمی ێشاندوە».

ئێمەش زۆر سەرسام بوین؛ هەر چەن من بەرەفیقەکانم وت با بچین ئەویشمان چاوپێ بکەوێ، بەڵام حەمەی سلێمان وتی: خزمینە! وازبێنن. ئەگەر وا بروا پیویستە هەتا خزمەتی حەزرەتی ئادەم بچین.

- کابرایەکی کورد ماڵی لە بیستانسور و ماڵی برایەکیشی لەسەیساق بوو. مانگی رەمەزان رۆژێک تووشی براکەی ئەبێ لێ ئەپرسێ ئەڵێ: کاکە! ئێوە کەی رۆژوتان گرتووە؟ ئەڵێ رۆژی جومعە. لە گەڵ ئەوە ئەمان رۆژی شەنبە بە رۆژوو بووبوون، ئەو رۆژە کە ٢٩ی مانگی خۆیان ئەبێ ئەڵێ بەخوا سبەینێ لەماڵێ کاکەم جەژنە با بچم لەوێ پلاو بخۆم و سبەی شەو بێمەوە. دوو سبەی لە ماڵێ خۆیشمان جەژنە؛ دیسان پلاو ئەخۆم.

هەی پێ لێ ئەکا و ئەڕوا. لەگەڵ شەبەقی بەیان ئەگاتە ماڵی کاکی، سەیر ئەکا هیچ مەنجەڵ و دووکەڵ دیار نیە؛ ئەپرسێ ئەڵێ: خۆ ئیمرۆ ئێوە جەژنتانە، بۆچی هیچتان دیار نیە؟ کاکەی ئەڵێ: بەخوا براکەم ئێمە دوینێ جەژنمان کرد چارناچار کابرا قاوەڵتی بەنان و دۆ ئەکا.

وەختی عەسر ئەڵێ وا چاکە خۆم بگەینمەوە لای خۆمان. داوێنی لێ بەلادا ئەکا نیوەشەو ئەگاتەوە ماڵ. ژنەکەی لەخەو خەبەر ئەکاتەوە ئەڵێ: «کچێ، ئیمشەو جەژنە هەڵسە هەر لەئێستاکەوە پلاوەکە لێنێ». ژنە ئەڵێ: مێردەکە هەر دوێنێ لەدوای تۆ مەلایەک هات فەرمووی ئیمڕۆ جەژنە. ئیتر هەموو ئاوایی کردیان بەجەژن و منیش دوێنێ پلاوم کرد. بەلام وامزانی سندان ئەخۆم بەبێ تۆ. کابرا هەناسەیەکی هەڵکێشا و بەمجۆرە لە هەر دوو جەژنەکە بوو.

- فەرا میرزا -حاکمی سنە- خەرج و باجی لە هەورامی ئەسەند. ڕەوشتی ئەو دەورەش وابوو پیاوێکی بەگالۆکێکەوە ئەنارده سەریان؛ ئەوانیش هەموو باجەکەیان کۆ ئەکردەوەو ئەیاندایەو ئەڕۆیشت.

ساڵێکیان لە شاری هەورامان بۆ ئەوەکە کابرای گالۆک بەدەستیان نەیەتەسەر، هەر لە پێشەوە پارەکەیان کۆکردەوەو دایان بە بەلەپا کە خێرا بیبا بۆ فەرامیرزا.

پارەیان نارد و کەچی کابرای گالۆک بەدەستیش هەر هات. وتیان بابە پارەمان ناردووە. ئەویش بەم قسانە وازی نەهێنا، پێنج شەش پیاوی ئا قلی باڵ بەست و لەگەڵ خۆی بردنی بۆ سنە بۆ لای فەرا میرزا. فەرا میرزا لێ پرسین، ئەوانیش وتیان قوربان بە «بەلەپا»دا خەراجەکەمان ناردووە. کە چوونە بنج و بناوانی بەلەپاوە، ئەمە کەروێشکە؛ تومەز ئەمە چوون پارەکەیان بەستۆتە پشتی کەروێشک و پێیان وتووە ئەم پارەیە بەرە بۆ خان و کەروێشکیان بەرەڵلا کردووە بەو نیازە پارەی بەرێ.

فەرا میرزاش ئەڵێ با بێنین تاقیان بکەینەوە بزانین ئەمەراست ئەکەن یا درۆ؟

هێنایان مێوژەرەشکەو قالۆچەیان تێکەلاو کرد و خستیانە بەردەستیان کەبیخۆن. ئەوانیش لێی کۆ بوونەوە. قالۆچەکان هەر یەکە بەلایەکدا ئەڕۆیشتن. هەندێکیان خەریکی خواردنی مێوژەکە بوون، چونکە نەئەڕۆیشت. یەکێکی ژیرتریان تیا بوو وتی: یانەت وێران بۆ، پاداری گێردێ، بێ پا ماڵ و وێمانەن. ئنجا فەرا میرزا وتی: بابەراست ئەکەن پارەکەیان داوە بەلەپاو بەرەڵلای کردن. کەروێشکیش لەو لاوە خوا ئەیزانی پارەی لەکوێ فڕێ دابوو.

- هەمزاغای‌مەسرەف شەوێک چەند پیاوێکی گەورە لە دیواخانەکەیا ئەبن. ئەویش خزمەتکارێکی ئەبێ پێی ئەڵێ: ڕۆڵە، سبەینێ پێویستە ئەبێ تا «گور گەدەر» بچی. گورگەدەریش دیی هەمزاغا ئەبێ. کابرا بەیانی زوو بەبێ ئەوە بچێ لە ئاغا بپرسێ ئیشی چیە، ملی ڕیگا ئەگرێ و ئەچێ بۆ گورگەدەر.

کویخاکەی گورگەدەریش -کەخزمەتکاری ئاغا ئەبێ- پیاوێکی عەنتیکە ئەبێ. لەکابرا ئەپرسێ خێرە وا هاتووی؟ ئەڵێ: بەخوا ئیمشەو گەڵێ میوانمان هەبوو، ئاغا فەرمووی پێویستە بەیانی بچی بۆ گورگەدەر، ئیتر منیش بەیانی زوو هەڵسام و هاتم. کوێخاش تێئەگا کە ئەم کابرایە دیارە زۆر عاقڵە ئەڵێ: باوکم وەختی خۆی ئاغام بە منی فەرموو هەر وەخت پیاوێکی ئازام نارد، باگردێنێکی بەرد لەسەر بانی مزگەوتەکەیا بەگوریس ببەستە بە کۆڵیەوە با بۆم بینێ؛ چونکە ئەگەر بە ولاخ بینێرن دوور نییە لەڕێ گوێژە ولاخەکە بکەوێ و باگردێنەکە بشکێ. ئیتر ڕۆی.

دوایی کوێخا باگردین لەکۆڵی کابرا توند ئەکا و خۆیشی لەگەڵی دێت. ئێوارە ئەچنە ماڵی ئاغایان. هەمزاغا کە ئەمەی چاو پێ ئەکەوێ زۆر پێئەکەنێ و کابرا خەڵات ئەکا کە ئەم بەزمەی بۆ ناوەتەوە. بە ولاخێکیشدا باگردێنەکە لە گەڵ کوێخا ئەنێرێتەوە بۆ گورگەدەر.

- کابرایەکی خەڵکی دێی «باخیان» ناوی حەسەنمەنگوڕی بوو، لەسەر پیاو کوشتن بۆ پانزەساڵ خرابووە بەندیخانە. شەش ساڵ بوو لەبەغدا حەپس بوو، ڕۆژێک پیاوێکی باخیانی ئەچێتە دێ «قەرەنگوێ» تەماشا ئەکا پیاوێکی پینەچی دانیشتووە کەوش پینە ئەکا، بەڵام زۆر شێوەی لە «حەسەنمەنگوڕی» ئەچێ. دێتەوە بۆ براکەی حەسەنی ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: پیاوێکی وا لەقەرەنگوێ پینەچییە، هەر وەکو حەسەنی براتان وایە. ئەویش دەست بەجێ سێ چوار کەسیتر لەخزمی خۆیان هەڵئەگرێ و ئەچێتە قەرەنگوێ تەماشای پینەچی ئەکەن. ئەڵێ: حەسەن: ئەڵێ: «باوکم من ناوم ئەحمەدە؛ ناوم حەسەن نیە». ئەوانیش ئەڵێن: «تۆ خۆت لە ئێمە مەگۆڕە؛ تۆ حەسەن مەنگوڕی و لە حەپسخانە ڕاتکردووە. لەترسی حوکومەت ڕاستی ناڵێی، هەڵسە بچینەوە سەر ماڵ و دەو لەت و ژنی خۆت».

هەر چەند کابرا مل پێچی و قنگەجڕێ ئەکا و سوێند ئەخوا من حەسەن نیم، ئەڵێن خزمە ئێمە دوڕ ناسین. تۆ هەر حەسەنیت، گۆیا ئەبێ ئێمە خزمی خۆمان نەناسینەوە؟

بەزۆر لەگەڵ خۆیان ئەیبەن بۆ باخیان. خەڵکی دێ هەموو لە ماڵی حەسەن مەنگوڕی کۆ ئەبنەوەو هەموویان بڕیاری لەسەر ئەدەن کە ئەم پیاوەحەسەن مەنگوڕیە. گورج تفەنگێ قۆناغ خڕ و دەمانچەیەکی پەرەبەلۆی ئەدەنێ، جلی بۆ ئەکەن و شەوێ ئەیخەنە باخەڵی ژنی حەسەنەوە. بەیانی ژنەکە ئەڵێ: خواهەڵناگرێ! ئەم کابرایە من بەحەسەنی نازانم. براو خزمەکانی حەسەن ئەیانگوت: تۆ ئاخۆ حەزت لەکێ کردووە، ئێمەقابیلە کەسی خۆمان نەناسین؟

بەم جۆرەمانگێک کابرا گڵ ئەخواتەوە، هەموو ماڵی حەسەن بە ژنەوە ئەیدەنە دەستی. هەتا رۆژێک کابرا هەندێ پارەشیان ئەبێ، بەتفەنگ و دەمانچەو شت و مەکەوە هەڵیئەگرێ و شانی پیا ئەکاو ئەڕوا. ئاخری لەدوای دوو ساڵێک حەسەن مەنگوڕی راستەقینە لە حەپسخانە بەر بوو هاتەوە چووە سەر ماڵی خۆی.

حەمەبەگی حاجی رەسووڵ بەگ ئەیوت ئەم حەسەن مەنگوڕیە خۆی و ژنەکەی مابوون و ماڵیان لە دێی «جونبلاغ» بوو؛ من هەر دووکیانم ئەناسی.

- لە مەرگە سێ چوار کەس لە بەگزادەکان دانیشتبوون باسی زەمانی پێشوویان ئەگێڕایەوە. «عەولابەگ»یان وتی: نە پیاوی گەورە وەکو گەورەکانی جارانن، نەپیاوی ئازاش وەکوو پێشینەکان ئازان. ساڵێک یووزباشبەکی رەدیف لە مەرگە بوو. ماڵی لە گەڕەکی «کانیسەردەشت» بوو. [...][20] حەمەبەگ فەرمووی بەگزادە ئەوە پیاوێکتان نییە ئەم کابرایە بکوژێ؟ خۆ ئەگەر وەها بمێنی ساڵێکیتر ژنەکانیشتان قاف ئەکا. ئیتر مەحموو بەگی شاخولکە هەڵسا تفەنگێکی تەرەقەی سەر و قنگ برنجەی بەدەستەوە بوو لێیدا رۆیشت. قەت سەعاتێکی پێنەچوو، دیوەخانەکە بڵاو نەبووبووەوە هاتەوە وتی: غولامی سەری حەمەد بەگم و دەستی ماچ کرد. سبەینی کە هەڵساین یوزباشیەکە کوژرابوو. ئیتر خوا هەقە حەمەدبەگیش گوڵنجەیەکی شیرداخی کرد بەخەڵاتی مەحمو بەگا.

- مەلاسالحی تەرەمار ئەبێ، پیاوێکی زۆر بەناو بانگ بوو. لە رەزە هەنجیرەکەیا تەنها یەک هەنجیری گەیشتوو ئەدۆزێتەوە، گورج بەرچنەیەک ئەهێنێ هەتا نیوەی گەڵای تێ ئەکەن؛ ئنجا هەنجیرەکە لەناو گەڵاکەدا دائەنێ و لەسەریشیەوە هەتا بەرچنەپڕ ئەبێ، گەڵای تێئەکاو ئەیگرێ بەکۆڵیەوە بەدیاری ئەیبا بۆ «سلێمانپاشا».

وا رێ کەوتبوو پاشاش هەر چ پیاو ماقووڵ و گەورەی بابانە، لەلای دانیشتبوون. پاشا ئەڵێ: مەلا ئەوەچییە بەکۆڵتەوە؟ مەلا ئەڵێ: قوربان هەنجیرە نۆبەرەیە بۆم هێناوی. پاشا ئەڵێ: بەخێربێ! هەڵی بپچڕە با هەر یەکە دانەیەکی لێ بخۆین و نۆبەرەیە بەلەزەتە.

مەلا بەرچنە هەڵئەپچڕێ هەر گەڵا دەردێنێ تا ئاخری تاقە هەنجیرێک بە دەستەوە ئەگرێ ئەڵێ: فەرموو پاشا. ئەڵێ: ئنجا مەلا من ئەوەچی لێ بکەم؟ مەلا هەنجیرەکە جوان

---

٢٠- لێردا چەن رستەیەک داکەوتووە؛ بە داخەوە لە چاپەکەی سەردەمیشدا هەر وا بە ناتەواوی هاتووە.و.

جوان پاک ئەکاو ئەیخاتەدەمیەوەو ئەیخوا ئەڵێ: پاشا ئاوای لێ بکە. پاشا قاقا دەست ئەکا بە پێکەنین و ئەڵێ: سەد قەران هەقی هەنجیرەکەو سەد قەران هەقی خواردنەکەی بدەن بەمەلا.

- عەولاپاشای‌بابان رۆژێک لە وەزیرەکەی خۆی توورە ئەبێ و ئەڵێ هیچ کەس نابێ هاتوچۆی بکا. کابرا شەوێک بە دزیەوە ئەچێتە ماڵی دۆستێکی کە لە هەوەڵا خۆی هێناویەتە پێشەوە. هەر چەند بانگی ئەکا دەرگای لێ ناکاتەوە. بانگی ئەکا ئەڵێ: تکات لێ ئەکەم هەر ئەوەندە وەرە ئەو دیو دەرگاکە منیش لە دەرەوە حەکایەتێکت بۆ ئەکەم، ئیتر ئەڕۆم نامەوێ دەرگام لێ بکەیتەوە.کابرا دێت لە دیوی ژوورەوە لەپشت دەرگا ئەوەستێ و ئەڵێ: فەرموو بزانم حەکایەتی چیم بۆ ئەکەی؟

وەزیر ئەڵێ: «کابرایەک بوو دوو ژنی هەبوو؛ یەکێکی سپی و جوان، یەکێکی رەش و ناشیرین. قەت نەئەچووە ماڵی ژنە ناشیرینەکە بنوێ. شەوێک لەگەڵ ژنەجوانەکە شەڕی ئەبێ. ژنەکە سویندی لێ ئەخوا ئەڵێ نابێ لەم ماڵی رۆژ بکەیتەوە. ئەویش ئەچێ بۆ ماڵی ژنەکەی‌تری. ژنە ناشیرینەکە ئەپرسێ ئەوە چلۆن بوو ئیمشەو هاتی بۆ ئێرە؟ ئەڵێ: بەخوا لە گەڵ ژنەکەی‌ترم شەڕمان بوو؛ منیش هاتووم بۆ لای تۆ. ئەویش ئەڵێ: ئەوە لەو لاوە دەریان کردووی بۆیە هاتوویتە لای من؛ سا بەخوا منیش داتناکەم و نایەڵم لێرە بنووی و دەرگای لێ ناکاتەوە. کابرا ئەڵێ: «ژنەڕەش، خوا رووی ژنە سپیەکەم رەش بکا کە هۆی منی خستە تۆو تۆش دەرم ئەکەی».

- کابرایەکی پاوەیی لە دێیەکەی خۆیان دێتە دەرەوە بە نیازی سواڵکردن. ئەگاتە قەراخ ئاوایی چاو ئەنوقێنی و دەست ئەکوتی بەردێکی گەورە هەڵئەگرێ. ئینجا روو ئەکاتە ئاسمان و ئەڵێ: «خوایە! تۆ ریشێکی پان و زمانێکی لووسم بدەرێ ئیتر رزقی خۆم لە سەر خۆم. شەرت بێ تا بە گرانایەتی ئەم بەردە پارە نەیەنمەوە، نەیەمەوە».

- کابرایەکی کورد کوڕێکی منالی خوشکەزای لەگەڵ ئەبێ. بەرێبواری شەوێک رێیان ئەکەوێتە ماڵە گۆرانێک. ماڵە ئەو شەوە نیسکێنە بە نۆکیان ئەبێ. کوڕە ئەوەندە ئەخوا هەتا لە لووتی دێتەوە. شەو کە ئەنوون لە نیوەشەوا تەقەیەک دێ، کابرای کوردە ئەڵێ ئەوەچی

بوو؟ کورە کە ئەڵێ: «خاڵە هیچ نەبوو، ئەوە من بووم شەقم برد». تومەس نۆکەکە تلیساوەتەوەو تەقاندوویەتی.

- ئاواییەک لەو بەر کێوەکاوانیانە بوو. پیاوێکی تەمەڵی تەوەزەل لەوێدا بوو، بانگیان کرد وتیان: گاوانیەکەمان ئەکەی یان نە؟ وتی: «ئەگەر کەرێکم بۆ کورتان بکەن سواری بم، هەمانیەکم مێوژ بدەنێ لە بەردەمما داینێم بیخۆم، منداڵیکیشم لەگەڵ بنێرن ئەگەر گاگەلەکە بڵاوەی کرد بۆم کۆبکاتەوە، بۆچی نایکەم».

- سێ جەردەلەشێوێکا تووشی پیاوێک بوون کەرێک و هەندێ شتومەکی پێ بوو. گرتیان رووتیان کردەوە. هاتن برۆن تەماشایان کرد وا خێڵێکی جاف لەو نزیکانەوە دەواریان هەڵداوە. وتیان: ئەگەر کابرای رووت کراوە هاوار بکا خۆ ئەم هۆبەیە ئەمانگرن. هاتن هەردوو قۆڵی کابرایان بەست و سواری کەرەکەی خۆیان کرد و بەناو ماڵەکانا بردیان. کابرا هاواری کرد خەڵکینە بۆ خاتری خوا ئەمانە جەردەن؛ رووتیان کردومەتەوە چارێکم بکەن. یەکێ لەجەردەکانیش ئەیوت: «خوا بکا تۆ چاک ببیتەوە قەیناکا با ئێمە جەردە بین».

خەڵکی ئاواییەکە پرسیان ئەمەچیە؟ جەردەکان ئەیانوت: «قوربان! ئەمە برامانە. سێ چوار شەو لەمە پێش چوو بووە سەر کانی دەستیان لێ وەشاندوەو شێت بوە. ئێمەش ئەیبەین بۆ سەر "میری سوور"». خەڵکەکەش وایان زانی ئەمانەراست ئەکەن. هەر چەن کابرا هاواری ئەکرد و سوێندی ئەخوارد کە خەڵکینە ئەمانە رێگرن و رووتیان کردومەتەوە ئەوان هەر ئەیانوت: «خوا و میری سوور شەفات بدەن». بەم جۆرە تێپەرین تا دوور کەوتنەوە. کابرایان بەرەڵا کرد و گوێدرێژ و شتومەکەکەیان برد و بەبێ ئارەق دەرچوون.

- کابرایەکی کورد چوو بوو بۆ بەغدا. کە هاتەوە خزم و دراوسێ هاتن بۆ لای. لەدوای بەخێر هاتنەوەو چاک و خۆشی، لێیان پرسی دەنگ و باسی بەغدا چیە؟ کابرا برایەکی هەبوو ناوی بارام بوو، پێیان ئەوت «بالک». ئینجا لە جوابی خزماندا وتی: «بەخوا عەشرەت دەنگ و باسی بەغدا هیچ نیە، بەڵام شۆرەتی هەر شۆرەتی بالکی برامە بەبازارا بەکۆڵانا هەر چی ئەڕوا هەر ئەڵێ، بالک، بالک».

– پیاوێکی دەوڵەمەند ئەسپێکی چاکی هەبوو، وون بووبوو. جارچی بۆ گرت کە هەر کەس بیدۆزێتەوە سەد قەران موژدە وەربگرێ. کابرایەکی کورد بە پەلەپەل چوو وتی: «ئاغە ئەسپی جەنابت گوم بووەو راستە فەرمووتە هەر کەس بیدۆزێتەوە سەد قەرانی ئەدەمێ؟» ئاغەوتی: بەڵێ ئیشەڵلا دۆزیوتەتەوە. کابرا وتی: «نەخێر نەمدۆزیوەتەوە هەر بۆی ئەگەڕێم بەلام هاتوومەتە خزمەت بەڵکە پێشەکی پەنجاقەرانێکم بدەیتێ، هەتا بەخێر ئەیدۆزمەوە».

– ئەم قسەش با لەسەر قسە کوردیەکان بێ ئەڵێ:

رۆژێک کابرایەک لە ئەستەموڵ ئەچێتە ئیدارەخانەی رۆژنامەیەکی بەیانی. بە مودیرەکە ئەڵێ: دوێنێ رۆژنامەکەتان مردنی منی نوسیبوو، سەرم سرما نازانم بۆچی بەدرۆ ئەوەتان نووسیوو؟ مودیرەکە ئەڵێ: «غەزەتەی ئێمە بەدرۆ هیچ نانووسێ. ئەگەر خەبەرێکی وا ناخۆشی نووسیبێ، هەڵبەت راستە». کابرا ئەڵێ: چلۆن راستە؟ ئەمەتە لەبەر چاوت ساغ و سەلیم راوەستاوم. پێویستە هەر ئەمڕۆ لە رۆژنامەدا ئەو خەبەرەی دۆێنێتان بخەنە درۆوە. مودیر ئەڵێ: «لێم ببوورە ئەمەی تۆ ئەفەرمووی رێ ناکەوی؛ چونکە رۆژنامەی ئێمە هەر شتێ راست نەبێ ناینووسێ وەئەگەر خوا نەخواستە خەبەرێکی درۆیشی نووسیبێ خۆی نابێ خۆی بەدرۆ بخاتەوە».

کابرا ئەڵێ: چلۆن؟ ئەی پیاوێکی زیندووی زل و زەلام بە مردوو نیشاندان مەعنای چیە؟ مودیر ئەڵێ: «بابە پێی ناوێ تەگبیرێکم دۆزیوەتەوە بەو جۆرەزیندووت ئەکەینەوە». ئەڵێ: ئا بزانم تەگبیرەکەت چیە؟ مودیر ئەڵێ: «ئێمە وەکو ئەوانەی کە ئەمرن مردنیان ئەنووسین، ئەوانەش کەتازە لە دایک ئەبن ئەوانیش ئەنووسین. ئینجا لەرۆژنامەی بەیانیماندا لە گەڵ ئەو منالە تازەبووانە ناوی تۆش ئەخەینەناوەوە». کابرا بەم قسەیەرازی ئەبێ و ئەڕوا.

– جارێک لەسولەیمانی فەقێیەکانی مزگەوتی گەورە تانجیەک راو ئەنێن هەتا ئەیکەن بە ژووری مزگەوتەکەدا. لەوێ هەموو قاپی و پەنجەرەی لێ دائەخەن و سەگ بەحەساری پێی ئەکەن. تانجی هەموو مزگەوتەکە پیس ئەکا و لە ترسانا ئەپەڕێتەوە سەر منبەرەکەو دەست ئەکا بەقوورەقوور. ئەو ئەقووڕێنێ و فەقێەکان بۆی ئەسیننەوە.

لەم هەرا هەرایە مجەورەکە ئەچی خەبەر ئەدا بە «سەیدئەحمەدیبابەڕەسووڵ» کە فەقیەکان سەگێکیان خستۆتە ژووری مزگەوتەکەو سەگ بەحەساری پێ ئەکەن.

سەیدئەحمەدیش تووڕەئەبێ و دار عەساکەی ئەگرێ بەدەستەوەو دێت بۆ فەقێەکان لێیان بدات.

فەقێ کە ئەزانن وا سەید هات، ترسیان لێ ئەنیشێ. یەکێکیان قومار باز ئەبێ ئەڵێ ئێوە لێگەڕێن ئێستە من چاری ئەم ئیشە ئەکەم.

سەید دێت و ئەڵێ: «هەی وا وا لێ کراوینە! ئەوە چۆن سەگتان کردوتە ژووری مزگەوتەوە؟» ئەو فەقێیان ئەچێ بەپیریەوەو ئەڵێ: «قوربان، بەسەری تۆ سەگ نەبوو تانجی بوو». ئیتر سەید سارد ئەبێتەوەو ئەڵێ: «تۆ خوا تانجی بوو؟ سا وەڵلا لام وا بوو سەگ بوو، کەواتە دیارە مجەوەرە قومارباز‌ەکە درۆی کردووە». فەقێش ئەڵێ: «نەوەڵلا قوربان تانجی بوو».

– ئەم قسەش هەر لەناو کوردا ئەگێرێتەوەئەڵێ:

موسولمانێک و جوولەکەیەک و گاورێک چوونە بەر دەرگای بەهەشت ویستیان بچنە ژوورەوە. قاپیوانەکەی بەهەشت لە موسولمانەکەی پرسی ناوت چیە؟ وتی: «محەمەد». پێی وت فەرموو بچۆرە ژوورەوە. لەگاورەکەی پرسی تۆ ناوت چیە؟ وتی: «پەترۆس». وتی: «یاڵلا دواوە، رێگە نییە». لەجوولەکەکەشی پرسی تۆ ناوت چیە؟ وتی: «قوربان شەلەمۆی خزمەتکارت». وتی: «یاڵلا دواوە دواوە دەموو فلقت خواتەوە».

لەپاشا جوە بە گاورەکەی وت: وەرە ئێستە من ئەتبەمە ژوورەوە. چوو گۆنیەیەکی هێنا گاورەکەی تێخست و دای بەسەر شانیا چوەوە بۆ بەردەرگای بەهەشت. دەرگاوان لێ پرسی ئەوە چییە؟ وتی قوربان کیسەو سەبیلی محەمەد لێ بەجێ ماوە بۆی ئەبەمە ژوورەوە». ئینجا وتی باشە بچۆ بۆێ بەرە.

– حەسەبێلوتە هەبوو لە سولەیمانی زۆر حەزی لە زەماوەن و هەڵپەڕکێ ئەکرد. لەرزۆکیش بوو کە ئەیبیست شایێک لە سەرشەقام هەیە، ئەم سەر بە بەیان لە لەرزەلەرز لە مەلکەندیەوە بۆی بەڕێ ئەکەوت تا ئەچووە سەر زەماوەنەکە ئەوان لەنیوەی ئەبوونەوە.

کەچووە ئەوێ ئەوا هەڵپەڕکێیە. ئەم خەریکی پشتێنەکەی ئەبوو رێکی ئەخست بە دەمیشیەوە ئەیوت: «دەی برانم دەی خەریک بن وا هاتم ئێستە بۆتان گەرم ئەکەم». کە لە پشتێنەکەی ئەبوەوە خەریکی رێکخستنی فەقیانەکەی ئەبوو. لەبەر ئەوە لەرزۆک بوو، بۆی رێک نەئەخرا. بەم بونەوە ئێجگار زۆر پێوەئەبوو. تا ئەم ئەمانەی ئەکرد شایی لێ ئەبوەوەو

خەڵکەکە بڵاوەیان لێ ئەکرد؛ ئەمیش بە هەناسەی سارد ئەگەڕایەوە. قەت بۆی رێ نەکەوت جارێک بەزەماوەنێکا بگات.

- مەلایەک لەو کوێستانە ئەچێتە هەر دێیەک لەپاش شەش حەوت رۆژ بار ئەکاو ئەڕوا. ئیتر هەر بەوەدا را ئەگا بارکا و کۆچ و باربخا. لە ئاخر دوو گوێدرێژی ئەبێ شت و شاتالی ماڵەکەی ئەنێ لەگوێدرێژییکیان و مەلا ژن و بیشکەکەش ئەخاتەسەر ئەویکەیان و دێ بەدێ ئەسووڕێتەوە.

ئەچێتە هەر ئاواییەک لە قەراخ ئاوایی ئەپرسێ ئەم ئاواییە مەلای هەیە؟ ئەگەر وتیان هەیەتی، ئەوا هیچ، بە بێ ئەوەلا بدا لێ ئەدا ئەڕوا؛ خۆ ئەگەر وتیان نیەتی ئەوا لائەدا.

رۆژێک بەسەر لاجانا ئەهاتە خوارەوە رێی کەوتەگوندێک. پرسی ئەم گوندە مەلای هەیە؟ وتیان نە. وتی کەواتە چار نیە، ئەبێ ببم بەمەلای ئەم گوندە. کۆچ و باری خست و خەڵکی ئاواییەکە لێی کۆبونەوە وتیان: «بابە ئێمە مەلامان ناوێ». وتی: «کورە ئێوە قسەی سەیر ئەکەن مەلامان ناوێ یانی چی؟ من واجب بوو لەسەرم ئەبێ دانیشم. جا ئیتر با ئێوە هەر بڵێن مەلامان ناوێ».

- کابرایەک لە پاش نیوەشەو بەناو شارا ئەسووڕایەوە، پاسەوانەکان هاتن گرتیان وتیان تۆ دزیت. وتی: باوکم من دز نیم، بەڵام نامەوێ بچمەوە ماڵی خۆم. هەر چەن قسەی کرد کەڵکی نەبوو، بردیان بۆ بەندیخانەو ئەو شەوە حەپسیان کردو بەیانی بردیانە لای قازی. قازی وتی: تۆ بۆچی ویستوتە دزی بکەی؟ ئەویش وتی: «جەنابی قازی من دز نیم بەڵام نیو سەعات موڵەتم بدەو پیاوێکم لەگەڵ بنێرە ئەچمە ماڵەکەی خۆم و ئەگەڕێمەوە. ئەو وەختە چیم لێ ئەکەی لێم بکە».

قازی وتی باشە و پیاوێکی لەگەڵ نارد. کابرا چوەوە ماڵەوە. ژنێکی زۆر ناشیرینی هەبوو وتی: «ژنەکە هەستە خۆت کۆ کەوە بابچین». ژنە کەوتە تەکی و چوونەوە بۆ لای قازی. کابرا دەستی برد پەچەی ژنەکەی هەڵدایەوە وتی: «جەنابی قازی یەکێ ئامە ژنی بێ، نەوەک تا نیوەشەو بەڵکو تا بەیانیش ئەچێتەوە بۆ ماڵەوە؟» قازی کە ئەمەی بیست و ژنەکەی چاوپێکەوت بەرەڵای کرد.

- کابرایەکی کورد لە دەشتێکا تووشی بەگزادەیەکی جوانی راوچـی ئەبێ. بـازیکی بـە سەر دەستەوەیەو دوو تانجی لەپێشەوە. شێوەی کابرای زۆر بـەلاوە جـوان ئـەبێ، دێتـەوە لـە مالـەوە ئـەیگێرێتـەوە ئەلـێ: «لـەو دەشـتە تووشـی بینـایـیچـاوان بـووم. جـورەییلـی لەسـەر دەستەوەو هەنکیر و مونکیریش لەپێشیەوە هەلقون هەلقونیان بوو».

- حەماغایباغلۆجە خزمەتکاریکی ئەبینێ ئاغەژن ئەینێرێ بۆ بۆکان بۆلای حەنا جوو هەندێ شتوومەکی ژنانی بۆ بێنێ. کابرا تا ئەچێتە بۆکان و لای حەنا، لەفیکری ئەچێتەوە کە بۆچییان ناردوە. هەر چەندە حەنا لێ ئەپرسێ بۆچی هاتووی کەلکی نابێ ئەگەڕێتەوە.
ئینجا دێ پارەکەی بۆ ئەبەستنە گۆشەی دەسەسریکەوەو ئەیدەنێ. پێ ئەلێن لە رێگادا هـەر بـلێ: «خەنـەو وسمـەو حـەنابێ» ئیتر لـەفیکرت ناچێتـەوە. ئـەمیش دیـت و لەرێگـەدا دەسەسرِ هەلئەسـوورێنێ و هەرکـەس قـسەی لەگـەڵ ئـەکا هـەر ئەلـێ: «خەنـەو وسمـەو حەنایی». بەمجۆرە دێتە بۆکان و بەناو شار هەلئەپەڕێ تا ئەگاتە لای حەنا جوو. ئیتر حەنا تێ ئەگاو بەرێی ئەکا.

- حاجی برایماغـای عـەنبار لەگـەڵ حەمـەرەحیمی خزمـەتکاریا ئەچنەسابلاخ. جمعە دادیت و ئەچن لەمزگەوتی سوور نوێژی جمعە ئەکەن. ئەگەڕێنەوە بۆ عـەنبار. برایماغـا لـە حەمەرەحیم ئەپرسی: «ئەرێ حەمەرەحیم نازانم چ رۆژێـک بـوو لەمزگـەوتی سـوور نـوێژی جمعەمان کرد؟» حەمەرەحیمیش تۆزێ فیکری بۆ ئەکاتەوەو پەنجەیەکی خۆی ئەنێتـە سـەر لێوی و لەپاشا ئەلێ: «وەڵلا ئاغە لام وایە رۆژی سێ شەنبە بوو». ئاغاش ئەلێ: «بە گۆڕێ بابم راست ئەکەی وا منیش کەوتەوە بیرم».

- دیناریکم لای مقدم ئەمین رواندزی بوو، نەیئەدامەوە. رۆژێـک دانیـشتبووین دەسـتی کرد بەقسە کردن و من هیچ دەنگم نەکرد. وتی: بۆچ دەنگ ناکـەی؟ وتم: چـارم ناچـارە، تـا دینارەکەم ئەدەیتەوە هەر شتێک بلێیت دەنگ ناکەم. ئەمین ئەمەی تۆزێ پێ خۆش بوو، ئیتر لـە هـەر شوێنێک دائەنیـشتین بـە ئـارەزووی خـۆی دەسـتی ئـەکرد بەقسەکردن. منـیش یـان ئەموت وایە وەیان هیچ دەنگم نەئەکرد.
رۆژێک لەبەغدا لە کۆڕێکا دانیشتبووین. خانوێکی هەبوو دابووی بە «سەعیدفەهیم» و لە سەر خانووەکە تۆزی تێکچووبوون. توورە بووبوو دەستی کـرد بەقـسە کـردن وتی: «من

پیاونیم. دیارە زۆر خراپم، ناجنسم، ئەگەینا چۆن خانوو ئەدەم بە سەعیدفەهیم؟ منیش هیچ سێ و دووم لێ نەکرد وتم: «ئەشەنوبیللا راست ئەکەی». ئەمیش بە مۆرێکەوە سەیرێکی کردم و دەستی کرد بەبالیا وتی: «ها ئەوە دینارەکەت و هەستە؛ برۆ من شایەتی وام ناوێ».

سالێک لە بەغدا بۆ دائرەیەکم نووسی کە بیست رۆژ ئەچم بۆ دەرەوە. ئەوا ئەحمەد حەسەن ناوم لەشوینەکەی خۆم دانا بە وەکیل و لێمدا رۆیشتم و هاتمەوە ئەم کاغەزە کەوتە مخابراتی رەسمیەوە. لەپاش بیست رۆژیتر کاغەزێکیان لەلایەن دایەرەوە دامێ نووسرابوو: «مانع نییە ئەم سەفەرەت بکەیت، بەلام لەبەر ئەوە وەکیلەکەت هێشتا ئیسباتی ئەهلیەتی نەکردووە ئەبێ وەکیلێکی‌تر دابنیت». منیش وتم: «کەواتە ئەم سەفەرەناکەم».

- مەلا محەمەدی شمیرانی رۆژی جومعەیەک لەخانەقی ئەچێتە سەر منبەر خوتبەی جومعە ئەخوێنێتەوە؛ شێخ عومەری دەکەش لەوێ ئەبێ. لەو کاتەدا کەمەلامحەمەد خەریکی خوتبە خوێندنەوەکەیە، شێخ عومەر -کەلەبەر منبەرەکە دانیشتبوو- بە دزیەوە کۆشی خۆی ئەگرێ و پیشانی مەلا محەمەدی ئەدا. مەلامحەمەد هەر لەناو خوتبەکەدا ئەڵێ: «بەفەخری عالەم! خۆت کەری خۆت کەری!»

- مەلاعیسای هەرتەل سێ قەرانی بەلای ژنێکەوە ئەبێ لەئاواییەکەی خۆیان؛ هەر داوای لێ ئەکاو پێ ناداتەوە. رۆژێک مەلا لەسەر دەرزە، خەریکە دەرز بەفەقێکانی ئەڵێ سەیر ئەکا ژنەکە وا مالی بارکرد و ئەروا. ئەمیش هەر لە دەرزەکەدا بانگ ئەکا: «ژنەکە! ئافرەتی چاک بە سێ قەرانەکەم بدەرەوە. ئەوا تۆ ئەرۆی ئیتر لەکوێ لێت بسێنمەوە؟» ژنە گوێ ناداتێ و هەر ئەڕوا. خێرا مەلا عیسا هەلئەستێ هەڕا ئەکا بەشوێنیا. لە دواوە سێ کوتی پێوەئەدا و ئەڵێ: «دەبرۆ قەحبە! هەر کوتی لە باتی قەرانێک».

- کابرایەک هەبوو لە چوارتا «شێخ محەمەدی گۆمەلی» ناو بوو. دەرۆزەی ئەکردو داوای لە هەموو کەسێک ئەکرد. هی وا هەبوو رۆژی پیشووتر پولی پێدابوو، ئیمرۆیش ئەچوو داوای ئەکردەوە. ئەویش ئەیوت ئەی دوێنێ نەمداتێ؟ ئەمیش ئەیوت: «دەک خوا بە زیادی نەکا! هێنەکەی دوێنێم لەسەر حساب ئەکەی؟»

- کابرایەکی هەورامی لەشوێنێک دانیشتبوو هەروا قسە هاتە سەر ئەوە کە ئێستە چیت و قوماش چۆنەو چۆن نییە. ئەویش وتی: «ئێستە بابەتی خاس نەمەنەن. من باوکم -خواش بیامەرزۆ- کراسێکش جە متقال کەردەن حەف ساڵ جەبەرش کرد (بەدو پەنجەدەستی برد یەخەکەی گرت وتی) ئانەش گجیەکەشەن».

- کابرایەکی «مایندۆلی» تفەنگێکی ساچمەی ئەبێ، هەڵیئەگرێ بچێ بۆ راو. ژنەکەی لێ ئەپرسێ: پیاوەکە ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟ ئەڵێ ئەچم بەڵکوو کەوێک بکوژم. ئەڵێ: ئەرێ وەڵلا بچۆ کە هێناتەوە سنگەکەی بۆ من. ئەڵێ وەڵلا نایدەم بەتۆ. سنگەکەی ئەبێ بۆ خۆم بێ. ژنە ئەڵێ: سا وەڵلا ئەبێ بۆ من بێ. لەسەر ئەمە ئەبێ بەشەڕیان، کابرا هیچ سێ و دووی لێ ناکا تفەنگیک ئەنێ بە ژنەکەیەوەو هەموو لەشی بریندار ئەکا.

- فەقیەک ئەچێتە لای مەلایەکی مەردۆخی دەرسی کتیبی جامی ئەخوێنێ. دوو ساڵی پیوە ئەبێ تا تەواوی ئەکا. مەردۆخییەکان خۆیان جامی ناخوێنن. کە لێ ئەبنەوە مەلا لێی ئەپرسێ: کاکە فەقێ چۆن بویت لەجامییەکەدا؟ ئەویش ئەڵێ: «قوربان! -خوا راوەستاوت کا!- ئەوەی من هەم، دەرزی وا پوخت و جوانم نەخوێندوە. جامی زانین هەروا ئەبێ کە جەنابت ئەیزانێ». مەلاش وتی: دەسا کاکەفەقێ من لەوەختی خۆیا جامیم نەخوێندوە. فەقێ تاسێک ئەیباتەوەو ئەڵێ: «هەی ئەحمەقی جاهل! کەتۆ خۆت نەتخوێندوە بۆچ بە منت وت و ئەمە دوو ساڵە هەر شتی غەڵەتم پێ ئەڵێی».

- کابرایەک لەشار ئەگەڕایەوە بۆ ماڵ، لەنزیکی ئاوایی کە سەیری کرد قەل فڕیکی سەیرە. تووشی شوانەکەی خۆیان بوو -کە بۆرەیان پێی ئەوت- پرسی ئەرێ بۆرە ئەو داڵان گەڕانە چییە؟ وتی براکەم ئەوە بە سەر کەلاکی گەماڵەبازەی ئێوەوە کۆ بوونەتەوە. وتی: بۆچ گەماڵەبازە تۆپی؟ وتی: ئەرێ وەڵلا. وتی بۆچی؟ وتی: ئەوەندە گۆشتی ماینەکولی خواردوو. وتی: بۆچ ماینەکول تۆپی؟ وتی: ئارێ وەڵلا. وتی: بۆچی؟ وتی: «وەڵلا برا تەرمەکەی مراوەیسی کاکەتیان لێ ناو. وتی: بۆچی کاکەم چی لێ هات؟ وتی: حەمەوەیس کوشتی. وتی: لەسەر چی؟ وتی: لەسەر قنگی خاتەی خوشکت. وتی: خاتەی خوشکم بۆچی؟ وتی: برا بێژم چی؟ بوختانیان پێوە کردوو. وتی: وەکێوە؟ وتی: خەڵک و خوا یێژن وەمنەوە».

- ڕەشەی‌مچەی‌نورەی سیتە بەسەری هەمەوەن هەبوو خەریکی جەردەیی و پیاو خراپی بوو. ڕۆژێک قائمقام سێ زەفتیە ئەنێری بۆ نورە بیگرن. زەفتیەکان سوار ئەبن و ئەڕۆن لە قەراخ ئاواییەکە تووشی ڕەشە ئەبن. ڕەشە لێیان ئەپرسێ ئەوە بۆ کوێ ئەچن؟ ئەڵێن ئەچین ڕەشە ئەگرین. ئەڵێ: جا ڕەشە بەئێوە ئەگیرێ؟ ئەڵێن پیمان ناگیری؟ ئیمانی ئەسووتێنین. زەفتیەکان هەر کەگوییان لێ ئەبێ ئەمە ڕەشەیە لە شوێنەکەی خۆیان وشک ئەبن. ڕەشەماین و تفەنگەکانیان لێ ئەسێنێ و بەرەلایان ئەکا و خۆی ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.

دایکیکی ئەبێ زەمزەمی ناو ئەبێ. پێ ئەڵێ: ڕۆڵە! تۆ بەمجۆرە بێ‌پەرواو سەرشێت بیت و کۆ لەکەس نەکەیتەوە، ئاخری یەکێ ئەتکوژێ و جەرگی منیش ئەسووتێ. کوڕی چاک بە لەسەر کەری شەیتان وەرەخوارەوە.

ڕەشە ئەم قسەیە ئەبیەت، هەڵئەکیشێتە خەنجەرو ئەیدا لە شلکەی ڕانی خۆی و خەنجەر دیوەدەر ئەچێ بەزەویەکەدا. بەدایکی ئەڵێ: «دەدایە وەرە کەری پێ ببەستەوە. من کەوا بم بزانم کێ ئەتوانێ بێت بمکوژێ».

- ئەحمەدی عەزیزاغا ڕۆژێک لەسەر سینی دائەنیشێ نان ئەخوا. پشیلەیەک دێ بە دیاریەوە دەست ئەکا بە میاوەمیاو. ئەم هەر بەشی ئەدا و ئەو هەر ئەڵێ میاو؛ لەمە زۆر وەڕەس ئەبێ، هەر هەڵئەستێ سینیەکە ئەنێتە بەردەم پشیلەکەو خۆی ئەچێ لەو لاوە ئەڵێ: «سەگباب! من میاو، کرانباو گاو! من میاو، دەبزانم تۆ بەشی من ئەدەی؟»

- ئەورەحیمی هەمەوەن بۆی گیرامەوە وتی: باوکم ڕەشیدی ناو بوو؛ پێیان ئەوت ڕەشەی‌عەزەی ئەحمەدعەلی‌سێتەبەسەر؛ قسەقسە ئەبڕێ، سێتەبەسەر تایەفەیەکی هەمەوەنن. پێنج برا هەبوون، ڕەشە، خەسرەو، حەسەن، حسین، غەفوور. ئەمانەگەورەی تایفەکە بوون؛ ڕەشەش گەورەی ئەمان بوو. دەستەی ئەمانە لە ئاوایی «جافان» و «مولەقە» لە خۆراوای چەمچەماڵەوە دائەنیشتن، بەلام خۆیان لەبەینی دوو ئاواییەکەدا قەلایەکیان دروست کردبوو، لەوێ بوون؛ ڕیگری و جەردەییان ئەکرد.

ڕەشە -بەرەحمەت بێ- لەنویژ و ڕۆژوودا زۆر قایم بوو؛ لەگەڵ شێخ و مەلاشا زۆر باش بوو. کە مەلا یا شێخیک ببوایە، بە یەکێ لەبراکانی ئەوت: «ئا کورە برۆ بەرخێ لە تالانیەکەی پار بێنە سەری ببڕە بۆ شێخ؛ ئەوە حەلالە با نانی حەرام نەخوا». مێوانەکەش

ئەیوت: ماڵی تالانی لەکوێ حەلالە؟ ئەیوت: «برا ساڵی بەسەرا سووڕاوەسەوە، ئێستە خاوەنەکەی لەفیکری چوەتەوە؛ حەلاڵ بوە».

– کابرایەکی «سیوسینان»ی هەبوو دیوانەیان پێ ئەوت‌و ماڵیان لە گوموتە بوو. ڕۆژێک لە گەڵ شێخ حەمەسالحی گوموتە ئەگەڕێنەوە هەندێ شتومەکیان پێ ئەبێ. لە ڕێگەدا تووشی ڕێگر ئەبن. شێخ حەمەسالح لە بنەژاڵەیەکدا خۆی ئەشارێتەوە. جەردەکان دێوانە رووت ئەکەنەوەو ئیتر بە شێخ‌حەمەسالح نازانن. دێوانە دەست ئەکا بە پاڕانەوە لێیان ئەڵێ: «بیکەن بەخاتری ئەو شێخە لەو بنەژاڵەیەدا وازم لێ بێنن». بەخوا جەردە بە شێخ ئەزانن و ئەچن ئەویش رووت ئەکەنەوە.

– مەلایەک هەبوو پێیان ئەوت: «مەلا مووسای‌کوڕی مەلامەنسوور. ڕۆژێک دێت بە سەریا ئەڵێ ئەم ناوەی من درێژە، با کورتی کەمەوە. دێنێ ئەڵێ: مەلا با فەقێ بێ؛ موو نەبێ خوری بێ؛ سی زۆرە با پانزە بێ. مەن با ڕەتل بێ، سوور باش نییە، با بۆق بێ. لە ئاخرا ناوی ئەبێ بە «فەقێ خوری پانزەکوڕی فەقێ ڕەتل بۆق».

– کابرایەکی کرمانج لە هەولێر بۆ ئیشی تەلاقی ژنەکەی ئەیبەن بۆ لای قازی. ناوبژیکەر ماوەی کابرا نادەن قسەبکا، قازیش دیارەگوێی بۆ راگرتوون. کابرا لەمە زۆر تووڕە ئەبێ کە نایەڵن ئەو قسە بکا. بە تووڕەییکەوە ئەڵێت: «دەخزمینە واز بێنن با من و جەنابی قازیش گووێک بخوین». قازی لەمە زۆر تووڕە ئەبێ و حوکمی کابرا ئەدا.

– وەستا گورونی دارتاش هەبوو لە سولەیمانی، ڕۆژێک حەمەی پوروەخەجێ ئەچێتە لای ئەڵێ: وەستا ئێمشەو کوڕێکمان بووە، بێشکەیەکمان بۆ دروستکە. ئەویش ئەڵێ: بەسەرچاو! دەسبەی بنێرە بۆی. حەمە ئەڕواو دوو سبەی ئەنێری بۆ بێشکە. وەستا گورون ئەڵێ: ڕۆژی جمعە. ڕۆژی جمعە بۆی چوونەوە. وتی سبەینێ. بە سبەینێ سبەینێ بێشکەی دوا خست و وردەوردە کوڕ گەورە بوو، باوکی ژنی بۆ هێنا. ئەویش کوڕێکی بوو. باوکی پێی وت: ڕۆڵەبڕۆ بۆ لای وەستا گوروون بڵێ باوکم ناردوومی بۆ بێشکەکە. ئەویش چوو پێی وت، وەستا گورون دیسان وتی سبەینێ.

کورەوتی: «وەستا ئەمە چ قسەیەکە وەختی خۆی باوکم کە پێی وتی ئەوە بۆ من بوو. ئێستەوا منیش ژنم هێناو کوڕێکم بوو. ئەم بیشکەیە هێشتا تەواو نەبوو؟» وەستا تووڕە بوو وتی: «کاکە بڕۆ خوات لەگەڵ! من ئیشی وا بەپەلەپەل ناکەم».

- کابرایەکی کورد شێت ئەبێ و ئەیبەنە شێتخانەکەی بەغدا. ڕۆژێک یەکێ لە کار بە دەستە هەرەگەورەکان ئەچێت بۆ سەیر کردنی شێتخانەو بۆ ئەوە بزانێ ناتەواوییان چییە. کە ئەچێ لەناو هەموو شێتەکانا سەیر ئەکا وا کابرایەک لەپاڵ دیوارێکا بە کزیکەوە دانیشتووەو دەستی خستۆتەژێر چەناکەیەوە.

ئەپرسی ئەمەچییە؟ ئەڵێن کابرایەکی کوردەو شێت بووەو هێناویانەتە ئێرە. ئەچێ بەلایەوە پێ ئەڵێ تۆ چیت؟ شێتەش هیچ خۆی تێک نادا ئەڵێ: «من نێرگەلەم». ئەڵێ چۆن نێرگەلەی؟ ئەڵێ ئەگەر بڕوا ناکەی تووتنم لەسەر دانێ بزانە چۆن دەست ئەکەم بە قوڵتەقوڵت.

کابرای گەورە لەمە زۆر سەری سڕئەمێنێ و بەراستی ئەیەوی ئەم ئیشەی بۆ دەرکەوێ. ئەنێرێ تووتنی نێرگەلە دێنن و ئەیدا بەکابرا. کابرای شێتەکلاوێکی پڕی لەسەرایە دایئەگرێ سەرەکەی چاڵ ئەکا و توتنەکەی تێ ئەکا و ئەیکاتەوەسەری؛ ئینجا دەست ئەبا کیری خۆی ئەگرێ و ئەیداتە دەستی کابرا و ئەڵێ: «ها نەفەسی لێدە بزانە چۆن قوڵتەقوڵت ئەکەم».

- کوڕێک هەبوو لە خانەقی ئیبراهیمی ناوبوو. کاغەزی بۆ پیاوی گەورەو بچووک ئەنووسی ئیمزاکەی ئەمەبوو: ئیبراهیم خان مجید خان سالار سولتان، رئیسی عەشایری جبورو باجەلان، سوڵتان قەزای خانقین و شارەبان.

- کوڕێکی جوولەکە لەو کوردەوارییە موسوڵمان بووبوو. هەرکە موسوڵمان بوو مرد. ئینجا خزم و کەس و کاری هاتبونەسەری ئەیانلاوانەوە ئەیانوت: جوانی بالا بەرز، موسا لە دەست دەرچوو محەمەد نەناسراومان ڕۆ. بولبولی چاسینن پاشقول دراوی موسوڵمانمان ڕۆ.

- گیانلەبەری‌تریش قسەئەکەن؛ بۆیە ئەڵێ: جارێک ڕێوییێک سەر لەبەیان بوو، لە بناری ئاواییەکەی باغلوجە گوێی لەدەنگی کەڵەشێرێک بوو لەسەر دارەکە ئەیخوێند. چوو بەلایەوە وتی: «فەرموو خوارەوە با نوێژەکەمان بکەین بەجەماعەت».

کەڵەشیرەکەش وتی: «ئیمام لە پاڵ دارەکەدا نوستووە خەبەری کەوە با نویژەکەمان بۆ بکا». کە ریوی سەیری کرد تانجییەک بەرچاو کەوت. ترپکی کەند و بۆی دەرچوو. کەڵەشێرەکە وتی ئەوە بۆ کویٚ؟ وتی: «فلانی دەستنویژەکەم شکا؛ تۆ راوەستە تا ئەچم تازەی ئەکەمەوەو دیمەوە».

- رشید جەودت سەرکردەی لەشکر ئەبیٚ لە دیوانیە. رۆژیک ئۆتۆمۆبێلیکی تاکسی دیت، ئەویش ئەڵیٚ: «جاالسیارە». پی ئەڵێن: «رشید بەگ نابیٚ وا بڵێت ئەبیٚ بڵیٚ جائت السیارە».

رۆژی دوایی لۆرییک دیت ئەویش ئەڵیٚ: «جائت الوری». دیسان زابتەکان پیی ئەڵێن رەشیدبەگ نابیٚ وا بڵێت ئەبیٚ بڵیٚ: «جا الوری».

ئەویش توورە ئەبی ئەڵیٚ: «هەی ناجسنینە! ئەمە چ زمانێکە؟ مەکینە یەک مەکینە، بەنزین یەک بنزین، تایە یەک تایە، ئۆتۆمۆبێلچی یەک ئۆتۆمۆبێلچی؛ ئیتر ئەم جا و جائتە لە کوێوە هات؟»

- ئەحمەدئاغای کەرکووکیزادە لە بەغدا هەموو دەردە دڵێکی هەر لە «ال»ی عەرەبی بوو، ئەیوت: «ئەم سەگی سەگبابە سەری لەمن تێکداوە. لە قسەکردنا ئەیخەمەسەر کەلیمە ئەڵێن نایەویٚ، نایخەمە سەری ئەڵێن ئەیەویٚ. نازانم چبکەم بەدەستیەوە؟»

- کابرایەکی مەنگوڕی هەر جارە لەپاش نویژکردن ئەپاڕایەوە لەخواو لەیەکی لەنزاکانیا ئەیوت: خوایە لە خۆم و لە ئاتەی دایکم و حایشەی خوشکم و پیزەی ژنم خۆش بی. کابرایەک رۆژێک پێی وت ئەی باسی باوکت بۆ ناکەی؟ وتی: «کاکەلی! بابم من منداڵ بووم مردووە، بیرم نایە. یەکیٚ کە نەیناسم چمالۆی بپاڕێمەوە».

- عەبدولحەکیم بۆی گێڕامەوە وتی: کابرایەک هەبوو لە نیسکاویٚ بناری سەردەشت مام رەسووی ناو بوو. پیاوێکی هەژار و پەریشان بوو. رۆژیک بیستی کە لەشکرێکی زۆر هاتۆتە سەردەشتەوەو دار پارەی چاک ئەکا. وتی بەخوا وا چاکە ئیمشەو بچم کۆڵەدارێک بکەم، بەیانی زوو بیبەم بۆ سەردەشت لە پێش ئەوەدا دارفرۆش بچن بەڵکو شتێکم دەست کەویٚ. «کۆتکە» نۆکێک خیری تۆ بیٚ.

شەوی پاش بانگی خەوتنان تەوراسەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت. زۆر دوور نەکەوتەوە، دارێکی بەگیر هێنا و چووە سەری و بە تەوراس تێی بەربوو.
هێشتا شتێکی وای لە دار نەکردبوو کوتوپڕ تەوراسەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە. لە دارەکە هاتە خوارەوە، دنیاش تاریکە. بەدەست بەشوین تەوراسەکەدا ئەگەڕا لە ناکاو کوچەڵەیەکی بەردەست کەوت کە هی کاروان و شتەبوو، لێیان بەجێ مابوو. ڕووی کردە ئاسمان و بەتووڕەیکەوە وتی: چما من چ بردارم کردیە؟ تۆ نۆکە کۆتکەت لەبەر دەستم دانایەو داوای نۆکی خۆت دەکەی؟

- ئاغەیەک خزمەتکارێکی تەمەڵی بێ فەڕی هەبوو. ڕۆژێک ناردی بۆ بازاڕ ڕۆن و برنج بکڕێ. زۆری پێچوو هەر نەهاتەوە، دوایی کە هاتیشەوە هەر برنجەکەی کڕیبوو، ڕۆنی نەهێنابوو. کابرا زۆر تووڕە بوو، گەلێ جنێوی دایەو پێی وت: سەگی سەگباب! مادام تۆ ئەمە کەتنتە جارێکیکە ناردتم بۆ هەر شتێک ئەبێ دوو شت بێنی.
ڕۆژێک کابرای ئاغە نەخۆش ئەکەوێ و بەخزمەتکارەکەی ئەڵێ: «ئا بچۆ پزیشکێکم بۆ بینە». ئەویش ئەچێ و لەپاش تۆزێک دێتەوە پزیشکێک و پیاوێکی‌تری لەگەڵ خۆی دینێ. ئاغە لێئەپرسێ ئەم کابرایەی‌تر چیە؟
ئەویش ئەڵێ: «ئەی ئەو ڕۆژە تۆ دەستت نەکرد بەجنێودانم و پێت نەوتم کە ناردتم بۆ هەر شتێک ئەبی دوو شت بێنی؟ ئێستە پێت وتم بچم پزیشک بێنم و ئەوا ئەوەیان پزیشکە؛ ئەگەر چاکی کردیەوە، باشە، ئەگەر خۆ چاکیشی نەکردیەوە ئەویتریان گۆڕهەڵکەنەو گۆڕەکەت بۆ هەڵئەکەنێ».

- لەقەراخ ئاواییەکەی بییانی کەرێک کەوتبوو خەریک بوو ئەتۆپی. کسۆکێک چوو بە لایەوە قنچکەی کرد. کەرەکە پێی وت ئەوە بۆچ قنچکەت کردووە لە لامەوە وتی: «ئەمەوێ بتۆپێ، بتخۆم». وتی: «من تا ڕۆژی شەنبە ناتۆپم». کەرکەسەکە وتی: «منیش تا ڕۆژی یەک شەنبە هیچ ئیشێکم نییە».

- ریوییێک کۆترێکی گرت. کۆترە وتی: «بزانم چارێکی خۆم ناکەم؟» هات لە ریویەکەی پرسی وتی: مام ریوی بێ‌عەوەوی نەبێ تۆ خەڵکی کوێی؟ وتی: «بانەییم».

لەگەڵ وتنی بانەو کۆتر لەدەمی بەرەڵا بوو فڕی. ئینجا ریویەکە دانی ریچ ئەکردەوەو ئەیوت: «ئاخ! ئەگەر ئەمجارە دەستم کەوتەوە ئەڵێم شاربازێریم، شار بازێریم».

– مەلایەک هەبوو لە چوارتا مەلا بابەکری ناو بوو. سەر بانەکەیان بەرەو رۆژ بوو، خەڵکی ئاوایی لەوێ کۆ ئەبنەوە. دوو کابرا هەبوون یەکێکیان مخەی ناو بوو، ئەویتریان ئەحە. رۆژێک ئەمانە هەر لەو سەربانە بوو بە شەڕیان.

مخە رووی کردە ئەحەو وتی: بڵێم چی؟ ئەگەر ئێستە لەبەر ئەم سەر بانی ماڵی مەلا بابەکرە نەبوایە پێم ئەوتی کۆنەقەتارچی؛ دەسا بڕۆ خوا بەقوربانی ئەم سەربانەت کا».

– کابرایەک هەبوو شەپەی ناو بوو، دڵی چوو بوو لە ئافرەتێک؛ بەتەواوی بۆی سووتا بوو. وای لێ هاتبوو هەموو کەس پێی زانیبوو. لە روویشی هەڵنەئەهات قسەی لەگەڵ بکا.

رۆژێک سەیریان کرد شەپە زۆر بەدەماخە. پێیان وت: شەپە چیە؟ وا دیارە ئیمڕۆ شتێک هەیە! وتی: خزمینە! خوا دەرووی لێ کردمەوە، ئیمڕۆ قسەم لەگەڵ دۆستەکەما کرد و ئەویش جوابی دامەوە. وتیان چۆن؟ وتی: کە چووم سەیر ئەکەم لەسەرکانی گەنم ئەشواتەوە بۆ ساوەر، منیش پێم وت: «ها وەڵلا ئەڵێ هەموو گەنمەکە بخۆم». ئەویش پێ وتم: «ها مانگایە مانگا».

– دەروێشێک موری گرتبوو، وردە وردە ئەڕۆیشت بۆ دەروێشی. کابرایەکی تووش بوو پێی وت: مام دەرویش رۆیشتنت چۆنە؟ وتی: «وەڵلا عەبایەک ئەخۆم و عەسایەک ئەڕۆم». وتی بەپانی یا بەدریژی؟ وتی: «ها، ها ماڵت کاول نەبێ بۆچ چەپەرم بەدریژی بڕۆم؟»

– ئەڵێ کابرایەک گیسکێک و مەیمونێکی هەبوو، لەگەڵیان رایئەبوارد. رۆژێک کابرا چووە دەرەوە. جامەماستێک لە ماڵا دانرا بوو، مەیمونەکە هێنای هەمووی خوارد و دەم و لێوی خۆی پاک کردەوەو چوو گیسکەکەی هێنا تۆزێ ماستی لەدەم و لووتی ئەو هەڵسوو جامەکەشی بەخاڵیتی لەو ناوەدا فڕێ دا خۆیشی چوو لەولاوە قیت و قنج لێی دانیشت.

لای نیوەڕۆ کە کابرا هاتەوە سەیری کرد جامە ماست هیچی نەماوە. سەیرێکی مەیموون و گیسکەکەی کرد تەماشای کرد مەیمون لەگۆشەیەکەوە بۆ خۆی کزۆڵەی کردووە

دانیشتووە. گیسکەش لەو لاوە بەدەم و لووتی ماستاویەوە هەڵقون هەڵقونیەتی. دارێکی هەڵگرت و چووە ویزەی گیسکی بەسەزمان. مەیمونەکەش لە ترسی ئەوە نەوەک کابرا دواجار با بداتەوەسەر ئەو، هەموو جار دەستێکی بۆ دەم و لووتی گیسکەکەدرێژ ئەکردو کابرای تێئەگەیان کەماستەکە گیسکەکە خواردویەتی. ئەوەتە هەمووی بەدەم و لوتیەوەیە. بۆ خۆی خۆیشی وەکو بەرزەکی سەربانان بۆی دەرچوو.

- کابرایەک لەو کوردەواریە کوڕێکی هەبوو. دنیا زستان بوو کورە هەر ئەچووە بەر بەفر و سەرماکە. باوکەکەی هەر چەند هاواری لێ‌ئەکرد کورە رۆڵە وەرە ژوورەوە نەخۆش ئەکەوی، کوڕە گوێی نەئەدایە.

رۆژێک بەفرێکی زۆر باریبوو چووەسەربانەکە بۆ بان ماڵین. باوکەکەی گەلێ هاواری لێکردو لێی پاڕایەوەکە بێتە خوارەوەو ئەم بانە نەماڵێ. پێی وت رۆڵە جەرگم مەسووتێنە، وەرە خوارەوە. کوڕە هیچ وەکوو گوێزی بۆ بژمێرن وابوو. ئینجا باوکەکە هات کوڕەکەی کوڕێکی کۆرپەی هەبوو، هەر باوەشی کرد بە کوڕە پچکۆلە داو بردی لەسەر بەفرەکە دایناـ. کوڕەکەی خۆی لەسەر بانەکەوە چاوی لێ بوو، لەوێ ئاگری تێبەر بوو، بانگی کرد: «ئای بابە! ئەوە ئەو کوڕە لەسەر ئەو بەفرە بۆچ دائەنی؟ ئاخر نازانی نەخۆش ئەکەوێ؟ دەلاییە لاییە بۆ خاتری خوا! کزە لە جەرگمەوە پەیدابوو». باوکەکەشی وتی: رۆڵە، تۆ بۆ ئەمە چۆنیت منیش بۆ تۆ وامە. ئەی بۆچ هەر هاوارت لێ ئەکەم گوێم نادەیتێ».

- لەقسەکوردییە ئەڵێ:

جارێک یاپراخ و کفتەو بروێش و تورشاو بوو بەشەڕیان. کفتە بە برویشی وت: بەخێر تۆش ناوی خۆتت ناوە شت؟ نە تامێک و نەشتێک؛ کەچی تەشریفیشت دێتەدیواخان.

یاپراخ رووی کرد تورشاو وتی: رەنگ بێ تۆش فیزێ لە خۆت بنێ و بلێت شتێکم؟ نە نانەرەق خۆی لە بەرتا ئەگرێ نە خەپلەی هەرزن ئەوێرێ توخنت کەوێ نە کەلەدۆینە پێت ئەوێرێ. بەلایەکیت کەوتویتە ئەم ناوەو سەرت لەعالەم تێکداوە.

تورشاویش بە وی وت خۆ من هیچ نەبێ وام بەرەوە، تۆ ئەڵێ دەستە بووخچەی تازەبووکی ناشیرینی چروکی توندوتۆڵ خۆتت پێچاوەتەوەو کەس نازانێ ناوسکت چی تیایەو دەستی خەلک ئەبری. ئەگەر فرو فێڵت تیا نییەو راست ئەکەی بۆچ وا خۆتت پێچاوەتەوە؟

«کارواناشی»ش لە گۆشەیەکەوەبوو، گوڵ لێ بوو. لە ژێر لێوەوە وتی ئەوە ئەڵێن چی؟ هەموو بە جارێ لێ هاتنە دەنگ وتیان: «تۆ خوا دەم و فلقت بەرە بەو لاوە، بێ تامەی ئاوی خاسەپیسی کەرە». لەم هەرایە پڵاو نوستبوو خەبەری بووەوە؛ کۆکەیەکی بۆکردو بە فیزێکەوە وتی: «ئەرێ هەتیوینە ئەو هەرا هەرایان لەچییە؟» ئەمانیش وتیان: «قوربان ئاغە کێ لەگەڵ تۆیەتی».

- سەید عەبدولحەکیم بۆی گێڕامەوە وتی: کابرایەک هەبوو زۆر تووڕەو کەللەشەق بوو، تەڵاقی ژنەکەی زۆر ئەدا. دوو جار تەڵاقی دابوو، هاتنەلای من بۆم چاک کردنەوە، هەموو جاریش پێم ئەوت برام تەلاق مەخۆ خراپە. پیاوێ پیاو بێ تەلاق ناخوا. ئەویش ئەیوت قوربان جارێکیکە ئیتر گووی وا ناخۆم.

وتی زۆری پێنەچوو ئەوەندەم زانی دیسان هاتەوەو وتی قوربان تەڵاقم خواردوە بۆم چاک کەوە. وتم برا تازەچاک ناکرێتەوەو بچنە لای مەلایەکیکە. کەچی وتی: «ئاخر قوربان چۆن بچین؟ ئێمە مشتەری تۆین چۆن ئەبێ بچینە لای یەکێکیکە؟ تا ئێستە ئەموت خۆم گووم خواردوە، ئێستە ئەڵێم باوکیشم گووی خواردووە. دەقوربان ئەمجارەش بۆمان چاک کەوە». وتم نابێ و دەرم کردن.

- شێخ بابەعەلی لەبەر سەیوانی مزگەوتەکەی خۆی دەرزی ئەوتەوە بە فەقیەکان، سەیری کرد هەراهەراو هەچەهەچەیەک پەیدا بوو. کە سەری بەرز کردەوە تەماشای کرد سێ زەلام کابرایەکیان بەسواری کەرێکەوە داوەتە پێش‌و بە زۆر ئەیکەن بە دەرگای مزگەوتەکەدا. بانگی کرد ئەرێ کابراینە ئەم کەر بازارە چیە؟ یەکێکیان وتی قوربان ئەمە بە سواری کەر چوەتەوە بۆماڵەوە. لەگەڵ ژنەکەیا دەمەقالیان بووەو تەلاقی خواردووە کە لە سەر کەرەکە نەیەتە خوارەوە». ئیمەش وا هاتووین بۆ خزمەتت.

بابەعەلی سەرێکی راوەشان و فەرمووی بیبەنە لای ئەو دار تووەوە. کابرایان کێش کرد بۆ لای دار تووەکە. ئەمجا پێی وت هەر لە پشت کەرەکەوە هەڵزنێ بەدارەکەدا. کە ئەو هەڵگەڕا، بە کابراکانی‌تری وت کەرەکەی لێ دوور خەنەوە. بە کابراکەی‌تریشی وت ئەمجا بە دارەکەدا وەرە خوارەوەو بچۆ بکوتەرە پاڵ ژنی خۆت تەلاقەت نەکەوتووە.

- کابرایەک ئەچێتە عابخانەکەی مزگەوتی بابەعەلی، سەیر ئەکا دەرگای عابخانەکان لەو دیوەوە هەموویان داخراون. ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە هەموویان خەڵکێکی تیایە. ئەچێتە بەر دەرگای عابخانەیەکی‌تر -کە دانەخراوە- دەکۆکێ بۆ ئەوە بزانێ کێ لە ژوورەوەیە. کابرەیەک لە ژوورەوە ئەبێ، ئەویش لە باتی ئەوە بە قرچە وەیا بەکۆکە جوابی بداتەوە، بە ڕێکەوت تڕێکی زۆر قایمی لێ بەر ئەبێ.

کابرای دەرەوەئەڵێ: «جا برا بەم تووڕەییە بۆچ جوابم ئەدەیتەوە؟ بۆچ من چیم وتووە؟»

- ژنیک هەبوو لە هەڵەبجە باجی زینەتی ناو بوو. لە بەر ئەوە تۆزێ جوانکەلە بوو، خەڵکوخوا زۆر بەتەمای بوون. گەلی شویشی کردبوو، بەڵام کور و کاڵ هەر لە لا کوڵان و ماکۆڵانا گل و خولیان بوو بەدەوریا.

باجی زینەت لەم دوا دواییەدا مێردی کردبوو بەپیاوێک ناوی «سۆفی عەزیم» بوو، تۆزێ گێلۆکەش بوو. ئەم میردەی سەر تەعازە بوو. ڕۆژێک سۆفی عەزیم ئەڵێ: «خاڵە عەزیم ڕێ زینەت گەورەیە یا بچوکە؟»

ئەویش ئەڵێ: «بەخوا برا نازانم؛ بەڵام وەپێ ئەوە کوڕ و کاڵ فرە وە دەور قنگیا تێن و ئەچن ئەشێ فرە بچووک وێ».

- کابرایەکی خەڵکی توراغ تەپە ناوی ئەلی هەسەن بوو، بۆ کاسبی ئەچێ بۆ وڵاتی ئەستەمۆڵ. ڕۆژێک لەناو کوڵانا کابرایەکی ئەستەمۆلی تووش ئەبێ لێ ئەپرسێ نیرەلی سەن. کابرای توراغ تەپەیش پێ ئەڵێ: «وەقوروانت وم ئەوە وەریشەکەما ئەزانی نیرم، ئەی وەچیا ئەزانێ ناوم ئەلی یەسەنە؟»

- کابرایەکی گاور لە کەرکووک لەگەڵ هەتیوێکا ڕێ ئەکەوێ. ژیر پردەکە گیرا بوو، ئەچن لەبن دیوارێکا لەقەلا پێی دین. کاتێ کە بە سەریەوە ئەبێ دیوارەکە ئەڕووخێ بە سەریانا و هەر دوو کیان ئەبن بەژێریەوە.

خەبەر ئەبەن بۆ قەشە. قەشە بەخۆی و کرێکارەوە دێنە سەریان و کرێکار دیوارەکە لا ئەبەن تەماشا ئەکەن کابرای مردویش هەر بەسەر هەتیوەکەوەیەو خەنجەر لە کێلانایە. قەشە کە چاوی پێیان ئەکەوێ ئەڵێ: «خوا لێخۆش بوو بەهەشتیە؛ هێشتا نەگەیشتۆتە بەهەشت خوا غیلمانێکی بۆ ناردووە».

- جوولەکەیەک هەبوو لە بانە شەلەمۆی ناو بوو. تۆزێ جوانکەلە بوو، چەرچێتی ئەکردو دوو گوێدرێژی هەبوو. هەموو جار باری ئەکردن لە شتووک و ئەچووە دەرەوە بۆ فرۆشتنیان. جارێکیان وا رێ کەوت کە ئەبوا بە کەلی خانا بڕۆیشتایە. ڕێگەش نائەمین بوو. کابرایەکی بە کرێ گرت لەگەڵ خۆی بردی بۆ ئەوەی بیپارێزێ لەپیاو خراپ و ڕێگر. کە ئەگەنە ناوەندی کەلی خان، کابرا خۆی جوولەکەکە رووت ئەکاتەوە هەر شتێکی پێیە لێ ئەستێنێ. سوێندیشی پێ ئەخوا بە حەزرەتی مووسا دەنگ نەکات. سەرەڕای ئەوە دێنێ ئەشیگێ بۆ ئەوە ئیتر بە هیچ جۆر هەر نەوێرێ قسە بکا. دنیا تەمومژ و هەورە رۆژ بوو.

کابرای جووە ئەگەڕێتەوە بۆ بانەو هەر هەناسە هەڵئەکێشێ، ناشتوانێ قسە بکا. جا ئەیانوت هەر رۆژێ تەمو مژ و هەورەرۆژ بوایە، رووی ئەکردەکەلی خان و ئەیوت: «بەخوا خەڵکینە! ئیستە لەو کەلە پیاوگاینە».

- کابرایەکی بێ چاو لە گەڵ چاوساغێکا بوو بە شەڕیان و چاو ساغەکە کوێرەکەی گرتو نایەژێر. هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ کە لە ژێرەوە دەست بەرێ گەڵ و گونی کابرای چاو ساغ بگرێ و بەوە پەکی بخا.

دەست لە دەست و قەوەت لەخوا، دەستی برد و گەڵ و گونی کابرای بەدەستەوە هات و وەکوو ئەسپێی کەوتبێتە مست، بەو جۆرە گووشی، بەلام گوشی! کابرای چاوساغ بەتەواوی بی هێز بوو. لەو کاتەدا هاوڕییەکی کوێرە هات و بانگی کرد: «ئای مامۆستا ئەوە لە ژێرەوەیت؟» ئەویش وتی: «بەخوا هەر چەندە لە ژێرەوەم، بەلام وەکوو لە سەرەوە بم وایە».

- کۆڕێک بوین لەلای وەستا بەشیر دانیشتبووین. هادی سائب هەبوو، ئەویس هات ویستی بێتە ژوورەوە، وەستا لووتی پیا نەهێنا. ئەو هەر گوێی نەدایە. ئەمجا پێی وت مەیەرە ژوورەوە. هەر گوێی نەدایەو هات. پاشان وەستا هەستا دەستی نا بەسنگیەوەو لێیان بوو بەشەڕ. لە سەر نەهاتنەژوورەوە هادی هەر هاتە ژوورەوە وتی: «بی قەزابی ئەمە چیە بە جارێ ناخۆشت کردووە کەی گالتەوا ئەبی».

لە کۆڕەکەدا مامۆستا رەفیق حلمیش هەبوو، هادی تکای بۆ یەکێک ئەکرد لە لای ئەو مامۆستاش پێی وت: «دەک موبارەک نەبێ! تۆ خۆت ئێسکت زۆر سووکە، ئەمجا نۆبەی

یەکێکی ترە». هادی هەر نەیخستە خۆی وتی: «بێقەزا بن! ئەمەچیە هەمووتان فێری گاڵتە بوون».

- ئەحەی کرنوو لەسولەیمانی ئیشی تایبەتی ئەوە بوو کە شەربەتی ئەفرۆشت. وەکو قسە کردنی عەنتیکە بوو، سەرو گوێلاکیشی هەر عەنتیکەو بەزم بوو. نێرەکەرێکی هەبوو، هەموو جار پێوە ئەچووە دەرەوە. حەکیمی بەسەرەوە ئەکردو ئەگەیشتەوە شارباژێر باری ئەکرد لە مێوژە رەشکەو ئەیهێنایەوە ئەیکرد بەشەربەت و ئەیفرۆشت. کە تەواو ئەبوو بۆی دەرئەچووەوە.

جێگەیان نەبوو لەماڵا، نێرەکەرەکەی لەبەر دووکانەکە ئەبەستەوەو کاو جۆی ئەکردەبەری و خۆیشی لەناو دوکانەکە هەر شەربەتی ئەکرد. گۆبەند لەوەدا بوو لەگەڵ ئەم بانگی ئەکرد: «شەربەتی سارد و شیرین» نێرەکەرەکەش لەو لاوە دەستی ئەکرد بەزەڕین.

خاڵەحەمەد بەمە زۆر تێک ئەچوو؛ رۆژێک هەر پەلاماری نێرەکەرەی ئەدا و جامانەکەی لەسەر خۆی کردەوەو بەستی بەسەر نیرەکەرەکەوە، رەشمەکەشی لەملی ئەو کردەوەو کردیەملی خۆی و نێرەکەرەی بردە ناو دووکانەکەو پێی وت: «دەسەگی سەگباب ئەگەر تۆ شەربەت فرۆشی فەرموو بزانم چۆنی ئەفرۆشی؟» ئەمەی پێ وت و خۆیشی چووە سەر کاو جۆەکە. ئەمجا نێرەکەر هیچ نقەی نەئەکرد، ئەمیش بانگی ئەکرد: «دە سەگی سەگباب! شەربەت بفرۆشە تا منیش دەستبکەم بە زەڕین؛ خۆ شەقم برد».

- کابرایەک لەو بناری شارەزوورە کە خێڵ ئەچێ بۆ کوێستان لەگەڵ خێڵ ئەڕواو ئەگاتە پێنجوێن. لەوێ ئەچێتە لای کابرایەکی بازرگان ئەڵێ: «ئا برا لەو باوەشە چەمەریەسی گەزم بۆ لی کەوە بۆ کەوا». کابرا سێ گەزی بۆ لی ئەکاتەوەو پارەکەی لێوەرئەگرێ و ئەمیش قوماشەکە ئەبا بۆ لای وەستایەکی کەوا دوور بۆی بدوورێ. پێ ئەڵێ: «ئا برا هەر ئێستە بۆم بدوورێنە وا خێڵ وەرێوەیە ئەچمەناو بازاڕ و تیمەوە هەق وەستاییەکەت ئەدەم و با بگەم وەخێڵ. کورە نێژی خێلی لەدەست دەرئەکەم وەو شێخ کەریمە وەگالۆک پشتت ئەشکێنم».

ئەمەی وت و لێیدا رۆیشت. دوو هەنگاو رۆیشت و نەرۆیشت گەڕایەوە دواوە بە پەلە پێیوت: «تۆ خوا برا بیژەنە وە ئاوەکەشا. ئیوە وەگۆوەنن با دوا جار نەیژی نەژەنیاگە وەئاوا کورت بوەسەوە». کابرای وەستاش وتی بە سەرچاو و ئەو لێیدا رۆیشت.

[کابرا گەڕاوە. وەستا]وتی برا خستومەتە ناو ئاو هێشتا وشک نەبوەتەوە. کابرا وتی: «وەو قورعانە شێخ لێ خوێندگیە ئەوا ئەچم سوورێکی‌تر ئەخۆم و تێمەوە، کەوام وەدوریاگی نەدەی وەدەسەوە هەزار خراوت پێ ئەکەم».

ئەمەی وت و لێیدا ڕۆیشت. زۆر دوور نەکەوتبووەوە یەکێ لەو بەری شیوەکەوە بانگی کرد: «کورە عەلەعەلەعەلە وا عێڵ گەیشتنە قنگە لووتکەکەی شلێر بۆ وێستیاگی؟ بێ وەڕێوە». عەلەکەگوێی لەمە بوو گالۆکی هەڵەشان و بەرا کردن چوو بەشوێن عێلا. پایز کە خێڵ سەرەو خوار بووەوە هاتەوە بۆ لای کابرای بەرگدوور وتی: برا کەواکەم پێ بدەرەوە. وەستاش وتی: برا من هەر ئەو وەختەدا خستمە ناو ئاو و چاوەڕێم بیتەوە لەبەر چاوی خۆتەوە خێرا بۆت بدوورم، تۆ هەر نەهاتیتەوە تا دوێنێ کە چومە سەری تەماشا ئەکەم هەمووی چووتە ئاو و هیچی نەماوە».

ئەویش وتی: چۆن برا؟ هەر گشتی چووەئاوا؟ وەستا وتی ئەگەر بڕوا ناکەی وەرەبا بچینە لای کابرا کە لێت کڕیووە. وتی باشە. پەلی گرت و چوونە لای کابرای بازرگان. وەستا پێی وت ئەرێ میرزا ئا ئەو تۆپە قوماشەچەندی لی ئەچێتەئاو؟ وتی: ئەو قوماشە زۆر نایابە، سێ گەزی لێ ئەچێتە ئاو. ئەمجا وەستا رووی کردەکابرا وتی: «ئا برا نەموت ئەوە سێ گەزەکەی داوە بەتۆ کە چوەتە ئاوەکەوە، تۆ بڕوا بەقسەی پیاو ناکەی».

کابرا رووی کردە میرزای بازرگان و وتی: «هەی بکەم وەقنگ دایکتەوە بۆچی سێ گەزە لە ئاو چووگەکەت دا وەمن» و خۆی تووڕەکرد و بەدەم سەر قالیەوە ڕۆیشت لە ترسی ئەوە نەوەک وەستای بەرگدوور هەقی کەواکەی لی بستێنێ.

جا هاتبووەوە بۆ ماڵەوە ئەیوت: «بکەم وەقنگ دایک کاورای بەرگدوورەوە هەقی کەواکەم پێ نەدا».

- کوڕێک بوین لە دووکان سەراکەی وەستابەشیر ئەقۆزرایەوە، ئەمجا ئەو باسی ئەوەی بۆ کردین وتی:

لەزەمانی عوسمانیا خۆم زابت بووم؛ ١١٤ کەسم لەبەر دەستا بوو. وتی ئێمە درابوین بە حوکومەتی عوسمانی. زوڵمێکی زۆر زلمان لێ کرابوو. سەربازەکانم هاتن وتیان چار چیە؟ وتم ئێستە من چارتان ئەکەم؛ هێنام بەدەستی خۆم ئێستعایەکم بۆ یەکێکیان نوسی بۆ قائدی هەرەگەورە. کە ئیستعاکەی برد بەخوا سەگ بە حەسارێکیان پێکرد بۆ یەکێکی‌تریشیانم

نووسی ئەویش هەر وا بەکورتی بەدەستی خۆم بۆ هەر ١١٤ کەسەکەم نووسی هەموویان گەماڵ کوژکران.

وتی سەرە هاتە سەر خۆم. وتم وەللا ئەبی بۆ خۆیشم بنووسم. هێنام هەر بەدەستی خۆم بۆ خۆیشم نووسی و بردم بۆ ئوزدەمیر. ئەویش هێنای جەم بۆریەسی کرد و هەموو سەرباز کۆبونەوەو بەدەورە وەستان. من و ئوزدەمیریش لە ناوەراستا بوین هەر لە ئۆغلم، ئۆغلم قسەی لەگەڵ کردم. . .

– مامۆستا بەشیر لەو رۆژانەدا خانویەکی بەدەستەوەبوو خەریکی دروستکردنی بوو. لەم کاتەدا کابرایەک هات، کاتیش دەمەدەمی ئێوارە بوو وتی وەرە ناوی کرێکارەکان بنووسە بۆ پارە پێدانەکەیان. وەستا لێ توورە بوو وتی برۆ جارێ ئیشمان هەیەو قسە ئەکەم ئەمجا گەرِایەوەسەر قسەکەو وتی:

یەکێ لە والیەکانی ئەردەڵان تاقەکورێکی ئەبێ ئەمرێ. والی بە هیچ جۆر سوکنایی نایە. یەکێ لە پیاو ماقوولەکانی رۆژێک لە بازارا کابرایەکی کەرک لەشان ئەبینێ کە جامەدانەیەکی لار و پێچی ناوە بە لایەکی سەریەوە. کەرکەکەی خستۆتە سەر شانێکی، گالۆکیکی بە دەسەوەیە چەماوەکەی خستۆتەسەر شانەکەی‌تری؛ نانێکی لوول داوە لە قولی دەستیایە، چەمیلەیەک وا بە دەستەکەی‌تریەوە، دانی چیر ئەکاتەوە قەپالێک لە نانەکە ئەگرێ و قەپێکیش لە چەمیلەکە، بەم جۆرە بەناو ئەو بازارەدا ئەرِواو شا بەگونی خۆی نازانێ.

کابرای پیاوماقوول ئەڵێ ئەم پیاوە بەمجۆرە ئەبەم بۆ والی، ئەگەر بەمە سوکناتی نەیەت بە هیچ شتێکی‌تر داناساکێ.

ئەچێ بە لای کابراوە قۆلی ئەگرێ. کابرا رائەپرسی و لا ئەکاتەوە سەیر ئەکا یەکێ قۆلی گرتووە. خۆی رائەچەنێ و ئەڵێ: «چیە کاورا پێژی میرغەزەوی شانت لێ بریگمەوە». ئەڵێ: «برا هیچ نیە، منیش خەڵکی ئەم شارەنیم؛ چاوم پێت کەوت دڵم پێت کرایەوە. ئا تۆ خوا وەرە با بچین لەو ماڵە زەماوەندە، بە یادی عەشرەتەوە دەستێ ئەگرین».

کابرا ناوی عەشرەت و زەماوەندی لێ دێنن، بسکەیەک لەسمێڵیەوە دێت و ئەڵێ: «ئا دەی تۆ خوا برا لەکویس با بچین». شوینی ئەکەوێ و ئەچن بۆ بارەگای والی.

کەئەچن و سەر ئەکەون والی لەو سەرەوە بە جلێکی جوانەوە لەسەر تەختێک دانیشتووە. کابرای کەرەک بەشان هەر کە چاوی پێ ئەکەوێ ئەڵێ: «سلاویک لەجوبرایل».

ئەڵێ: کورە گەوجە من جورایل نیم. ئەڵێ: «کەواسە سلاویک لە پێغەمبەر». ئەڵێ: کورە

کابرای شێتە من پێغەمبەر نیم. ئەڵێ: ئەی دەویت باوک تۆ نەخوایت و نەجورایلیت و نە پێغەمبەری چی ئەکەی لەو بەرزیەوە وەک سیچکەسلاو دانیشتگی؟ هەی کوتامەدایکت! گالۆک رزگاری ئەبێ و ئەمیش پەلاماری گالۆکەکەی ئەداتەوەو هەڵیئەگرێتەوە. لەو کاتەدا کە گالۆکەکەی هەڵئەگرێتەوە ئاوێنەیەکی بالانما لەو سەرەوە دانرابوو کابرا خۆی لەئاوێنەکەدا ئەبینێ. وێنەیەکی سەیری دێتەپێش چاو. چاوێکی لێ مۆڕ ئەکاتەوە. وێنەی ناو ئاوێنەکەش -کە ئەم هەر خۆیەتی- ئەویش چاوێک لەم مۆڕ ئەکاتەوە.

کەوا ئەکا دەست ئەداتە گالۆکەکەی و ئەڵێ: «ئای هیزە، کوچکت لێ نەوارێ خۆ ئەو کاورای تاینگ گەرەکیە لەم غەریویەدا سەرم بدا وەقەلبەیەکا. ئای کوتامەقنگ دایکت هەی». ئەمەئەڵێ و گالۆکێک ئەگرێتە ئاوێنەکەو ئاوێنە هارە ئەکاتە خوارەو ئەڵێ: «ئاوا دایکت ئەگێم دەبیخۆ دەویت باوک». والی لەم ئیشە ئەوەندە پێئەکەنێ ئەکەوێ بەگازی پشتا.

پاش ئەمانەوالی ئەمر ئەکا کابرا دائەنیشی و هەروا سەر ئەخاتەسەری و قسەی لەگەڵ ئەکا و لەقسەکانی بەتەواوی هەموو خەمێکی لە بیر ئەچێتەوە.

نان دێتە ناوەوەو فڕنی لەسەر سینی والی ئەبێ. ئەڵێ ئەم فڕنیە بۆ ئەو دابنێن. کابرا فڕنی بۆ دائەنێن و دەست ئەکا بەخواردنی. هەر لەگەڵ کەوچکێکی لێ ئەخوا گورج هەڵئەستێ. [والی ئەڵێ] ئەوە بۆچ وات کرد؟ ئەڵێ: «قوروان فرەخز و سافە. ئەترسم گورج لەخوارەوە دەرچێ». والی ئەوەندەیتر پێ ئەکەنێ.

پاشان لێی ئەپرسێ ئەمەچی بوو خواردت. ئەڵێ: «قوروان باوکم گجارێ هاتگەسە شار کە ئەهاتەوە ئەیوت مزگەوتی جامعەو حەمام فرە خۆشن. ئەمە یا مزگەوتی جامعەس یا حەمامە». پاش ئەوە کە والی بە تەواوی سەبووری پێ دێ، خەلاتی ئەکا و بەرەلای ئەکا.

- محەمەدی‌مەلاکەریم چەند قسەیەکی نارد بۆ رشتە لەوانەدا گێڕایەوە وتی: «رۆژێک ژنێکی شاتری کوڕێکی منالی هەبوو نەخۆش بوو. ئەچێتەلای شێخ‌حەسەنی‌قەیتول نوشتەیەکی بۆ بکا. کە ئەچێ لەو کاتەدا شێخ هێلکەو رۆنی لەبەر دەما ئەبێ ئەیخوا، هێلکەو رۆنەکەش نیمرۆ ئەبێ؛ زەردێنەکەی بڵاو ئەبێتەوە بەسەریا.

شێخ لە ژنەکە ئەپرسێ کە کوڕەکەت چییەتی؟ ئەڵێ: «قوربان! بی عەدەبی نەوێ کە دائەنیشێ، دانیشتنەکەی لەوەی بەردەمی شێخ فرەزەردتر و تەڕترە. ئەوا هاتگم بەڵکوو شێخ دەم و نەفەسێکی بۆ بخاتەکار».

شێخ سەیر ئەکا ئەم ژنە قسەی خۆی پێ وت؛ وتی چارێکی نەکەم کەلک ناگرێ. هێنای قاقەزیکی وەکو نوشتە بۆ پێچایەوەو دایەو وتی بچۆ ئەمە بیگرە مۆم و بیلکێنە بە دەرگای قنگی کورەکەدا. بە هیمەتی پیران چاک ئەبێتەوە».

ژنەکەش ئەچێ وەکو شێخ ئەفەرموێ وا ئەکا. پاش چەند رۆژێک ئەچێتەوە بۆ خزمەت شێخ. شێخ لێ ئەپرسێ ها دایکم کورەکەت چۆنە؟ ئەڵێ: قوربان! خوا هەر بوتێڵێ بۆمان. لەو رۆژەوە دەم و نەفەسەکەی تۆم بۆرێگە وەقنگیا تکەتکە نەوێ دانانیشێ. شێخ ئیتر هیچی پێ ناوترێ.

- فەقیەک لەو ولاتی لاجانە دلی بەکچێکی درواسێ حوجرەوە ئەبێ. فەقێەکە «تەسریفی زەنجانی» ئەخوێنێ کەدەوری ئەکاتەوە لەسەر بانەکە هەموو جار ئەڵێ: «اعشوشب، یسوشب، اعشیابا» ئەمە دەوری فەقێیانی تەسریفی زەنجانیە.

شەوێک فەقێ بۆی رێ ئەکەوێ لەبەر ئەوە کە لە گەڵ کچەکەدا دلیان پێکەوەبوو، کچە هەڵئەگری و ئەڕوا. بەیانی کە باوکی پێئەزانێ ئەڵێ: «من هەر ئەبوا زوو بمزانیایە ئەو باوەحیزە هەموو جار لەسەر بانەکە دەگەڕاو ئەیووت ئیمشەو شەو نە، ئیمشەو شەونە؛ هەتا بۆی رێکەوت ئیمشەو کردی بەپەلیا و بردی».

- لەو کویستانە مەلایەک بەلای خێڵێکی رەشو بۆریدا تێ ئەپەڕێ؛ برسی ئەبێ، ئەیەوێ لابدا نانیک بخوا. سەیر ئەکا زەماوەند و هەراو هەڵپەرکێیە؛ کچ و کوڕ دەستیان گرتووە قوولەیە. نان ئەخواو پاشان لە کوێخاکە ئەپرسێ ئا خۆ ئەم کچە مارەکراوە؟ کوێخاش ئەڵێ: «مەلا بیوورەوە! کەنیشکی خۆمانەو بۆ کوری خۆمانی تێرین، مارەی نەگەرەکە. نازانم تۆ گوو خۆری کوێیت و لەکوێوە هاتگیت؟ نانی خۆتت خواردگەو هەڵسە بچۆ وەرێ خۆتەوە، لەم شاییەدا خوێن مەگێرە».

پاشان بە هەر زمانێک ئەبێ مەلا ئیشیکی وا ئەکا مارەی کچەکە ئەبڕێ لەکورەکە.

- رەشەی خەجەلاو هەبوو لەسولەیمانی مریشکێکیان ئەبێ، رۆژێک مریشکەکە هیلکەیەک ئەکا و ئیتر هەر ئەیکا لە گارەگار تا چەند رۆژ نایبرێتەوە. رەشە بە تەواوی پەست ئەبێ، هەڵئەستێ هیلکەکە دینێ ئەیخاتە پریاسکەیەکەوە ئەکاتە ملی مریشکەکەو

ئەڵێ: «دەبڕۆ سەگی سەگباب! ئەوەخۆت و ئەوە هیلکەت. خۆ تۆ بۆ ئەم هیلکەیە مێشکی ئەو عالەمەت برد، گووم بەخۆت و بە هیلکەت».

**لەقسەکانی شێخحسینیقەرەداغی:**

ئەم شێخ حسینە پیاوێکی ئەستووری ورگ زلی قەویلەبوو؛ گیپەرەی ملی لەبەر چاخی باوەشێک بوو؛ لەبەر ناوشانی پانی کورتەبالا ئەهاتەبەر چاو. دەنگی ناسک و قسەی بەتام بوو. برایەکی هەبوو ئیبراهیمی ناو بوو. ئەو بالا عەرعەریکی تۆزێ ناوقەو باریکی لەبەر بەرزی هیچ ئەستووری پێوەدیار نەبوو.

ڕۆژێک لەشێخ حسێن ئەپرسن: بۆچی برایمی برات لەتۆ لاوچاکتر و ڕێک و پێکترە؟ ئەویش کوتوپڕ ئەڵێ: «ئاخر ئەو چوار پراوەکراوە». لەراستیدا برایم چوارەمین سکە. هەر لەم کاتەدا شێخ حسێن کچێکی ئەبێ ئاواز جوانکەلەی ژیکەلەی دەم بەپێکەنینی ڕێک و پێک و نوسکە ئەبێ. لێ ئەپرسن: ئەی کچی تۆ بۆچ ئەوەندە جوان و ڕێکە؟ شێخ مستەفای باوکی شێخ حسێنیش لە کۆڕەکەدا ئەبێ و گوێی لە هەموو ئەم حەقایەتانا ئەبێ، ئەویش کوتوپڕ ئەڵێ: «ئەو زووتر براوەی خۆی کردوە».

– هەر لەو کۆڕەدا کە دوو باب پێکەوە ئەبن و ڕاوەستاون، برایم بەشێخ حسێن ئەڵێ: «کاکە! تۆ ئەزانی من لەتۆ درێژترم». ئەمیش ئەڵێ: «کورە تۆ نابێ قسەی پیاوانە بکەی تۆ نازانی من لە باوکی تۆش درێژترم». لەڕاستی دا باوکیان لە هەر دووکیان کورتتر ئەبێ.

– شێخ حسێن بابی لێ تووڕە ئەبێ پێی ئەڵێ هەستە لاچۆو لەبەر چاوم ئەڵێی ورچی. ئەویش پێی ئەڵێ: «جا بۆچ بەمن ئەڵێی، بەو کەسە بڵێ کە دروستی کردووم». باوکی ئیتر پێئەکەنێ و خاو ئەبێتەوە.

– کۆڕێک بووین چووین بۆ سەر شەتی بەغدا بۆ ماسی خواردن و هەر یەکە هەندێ پارەمان دا. وتی زۆری پێنەچوو یەکێ لە هاوڕێکان هات پێی وتم تۆ پەنجا فلس قەرزار ماویتەوە. وتی منیش لە بیست فلس زیاترم پێ نەبوو، وتم: ئەمە بیست و ماسی. هاوڕێی سێهەم هات وتی ئەوە چی بوو؟ وتم: «بۆچی تۆ نەتبیسن؟» شێخ حسێن وتی دەستەیەک بووین، یاری ئەکرا دانیشتبووین یەکێکیان پێی وتم وەرە لای من دانیشە. ئەمەوێ «قاپۆتی»

لەمە بکەم؛ یانێ سێ نوختەی لێ بکەم. وتی منیش وتم: «کەوابوو منیش چاکەت لەگەڵا ئەکەم وا دێمەپاڵ تۆ بۆ ئەوە ئەم قوندەرە بدووریێنی».

## بردمانەوە یان نە؟

ساڵی ١٩٥٧ بوو؛ بەرگی یەکەمی رشتەی مرواری دەرچوو. لەو بەرگەدا لە سەرەتاکەیا وتم ئەم بەرگە دەرئەچێ زۆر کەس ئەکەونە تەقە کردن، بەڵام لە ئەنجاما وا نامێنی و نرخی ئەزانرێ. نرخی رشتەی مرواری زۆری پێنەچوو هەر لەو ساڵەدا بەرگی دووەمیشی دەرچوو. بەرگی سێیەمی لە ساڵی ١٩٥٨ دا هات بە شوێنیا. هەر دوو قسەکە هاتە دی؛ قسەی یەکەم کە زۆر کەس کەوتنە تەقەو دەستیان کرد بە رەخنەگرتن، بەڵام بەرەکەت دا من هیچ گوێم نەدایە.

بەرەبەرە قسەکەم بووەوو وای لێ هات ئەوانەی کە زۆر لە دژی بوون، بە دزیەوە داوای خوێندنەوەیان ئەکرد. ئینجا کەوتە دەوری نرخ دەرکەوتن و نرخ زانینەکەی؛ سەیرم ئەکرد ئەوانەی کە لە سەرەتاوە زۆر رەخنەیان لێ ئەگرت، ئەوانە زیاتر بە ئارەزوو بوون بۆ خوێندنەوەی و بۆ دەرچوونی بەرگی‌تری.

ئەمەش لە بەر چی بوو؟ دیارە ئەو دەستەیە کە ئەو بێزارییەیان لە شتی وادا دەرئەبڕی، دەستەیەکی خوێندەواری تێگەیشتوو بوون. لە باوەڕی ئەو رۆژەی ئەوانا بە لایانەوە وا بوو نابێ ئەم جۆرە شتانە بکەونە سەر قاقەزو بکەونە بەردەمی هەموو کەسێکەوە. لە پاشا هەر ئەو جۆرە دەستەیە خۆیان لە خۆیانەوە بۆیان دەرکەوت کە ئەمە ئەدەبەو کەلەپووری ئەدەبی ئێمەیە، نابی سەریان تیابچێ و لە ناو بچن. لە ڕووی ئەم باوەڕەوە ئەوان گەلێ زیاتر بە شوێن بەرگە چاپ نەکراوەکانی‌تریا ئەسووڕانەوە. کە گەیشتنە ئەم شوێنە باوەڕی هەردوو لامان یەکی گرتەوە کە ئەمانە ئەدەبی نەتەوەکەمانەو ئەبێ بمێننەوە. بەڵام عافەرەم بۆ خۆم کە کۆڵم نەداو پاڵم بە توانجەوە نا تا لە گەڵ ئەوانا بووین بە یەک. ئۆ! خۆزگەت پێ وێ

قسەی پار ئەگێڕیتەوە. ئەوەندە هەبوو لە ماوەی ئەم هەشت نۆ دە ساڵەدا هەر رۆژە سازێک و هەر دەمە ئاوازەیەک پەیدا ئەبوو. ئەو سازو ئاوازەیە سەری لە دەستەی دووەم تێکدابوو، وای لێ کردبوون ئەو سۆزەی کە سەرەتا بۆ خوێندنەوەی شتی وا هێنا بوو، ئەو سۆزە ئاڵا بوو بە باڵای شتی‌تر. بەرەبەرە بۆیان دەرکەوت کە ئەو شتانە هەموو پل و پووشن و با ئەیان با؛ وەکو بردنی. ئنجا ئەوانیش گەڕانەوە بۆ شتە بناغەییەکە؛ بۆ ئەو شتە کە ئێمەش نەتەوەیەکین و هەموو جۆرە ئەدەب و فۆلکلۆرێکمان هەیەو ئەدەب و فۆلکلۆرمان ئەگەر خۆیشمان بڕۆین، ئەوان ئەمێننەوە. کە ئەوان مانەوە، مانەوەی ئەوان مانەوەی خۆمانە؛ چونکە نەتەوەیەک ئەگەر بیر و باوەڕ و زمانەکەی کەوتە سەر قاقەزو کەوتە بەر چاو، ئەو نەتەوەیە لەناو چوونی نابێت با بە هەزاران تاوێریش بپلیشێنرێتەوە.

لە بەر ئەم شتانەو لە بەر هەموو رووڵێنانە کە روویان لێ ئەنام، بە تایبەتی لەم ماوەی دواییەدا بۆ لە چاپ دانی بەرگەکانی‌تری ئەم کتێبە ئەوا منیش پاڵم نا بەو دیوارانەوە کە ئەهاتنە سەر رێگاکەم، ساف کرد و کەوتمەوە مەیدانی لە چاپدانی بەرگەکانی‌تری رشتەی مرواری.

جارێک لە مەدرەسەی تورجانیزادەکان فەقێیەک هەبوو لە لای مەلا عەلی گەورە خوێندبووی. مەلا عەلی عەمری خوا ئەکاو مەلا حەسەنی کوڕی لە جێگاکەی دائەنیشێ. کاکە فەقێ لە لای ئەویش ئەخوێنێ. مەلاحەمەحەسەن ژن دێنێ و کوڕێکی ئەبێ؛ کوڕەکە مناڵ ئەبێ، رۆژێک ئەیبەن بۆ حوجرەی فەقێیەکان. کاکە فەقێ پڵتۆکێک ئەدا بە سەر ورگی منداڵەکەداو ئەڵێ: «ئم! ورگە ئەگەر نەمرین لای تۆیش ئەخوێنین.» ئیستە منیش: «ئم! ورگە ئەگەر نەمرین گەلێ بەرگی‌تری ئەم کتێبە ئەخوێنینەوە.»

ئەبێ ئەوەش بزانین کە ئەرکی چاپیش لە چاو ئەو ساڵانەدا یەکاویەک زیادی کردووە.

عەلائەدین سەجادی- بەغدا

١٩٦٨/٩/٢٥

# تاقگەی ئێلاخ

- فەرامیرزا لە سنە، بارام‌سانی یەکەم لە هەورامان بانگ ئەکا بۆ سنە. ئەمیش بە چەند پیاوێکی خۆیەوە ئەچێت و میوانی حوکومەت ئەبێت. ئەمان هەموو لە «دەرماڵ»ئەبن. بارام‌سان شوێنێکی شاهانەی بۆ تەرخان ئەکرێت، بە تایبەتی ژوورێکی ئاوێنە بەند ئەبێ لە دەر ماڵەکە دانراوە بۆ پیاوانی گەورە، ئەمە دائەنێن بۆ بارام سان کە کەسی‌تری تیا نابێ.

شەوێک سان ئێشی سەر ئاوی ئەبێ کە هەڵئەستی دەست ئەنێ بە دەرگاوە سەیر ئەکا دەرگا لەو دیوەوە داخراوە. ئەمەش ڕێکەوت بوو؛ ئەگینا هەموو وەخت وا نەبوو. بەمە زۆر تێک ئەچێ و خۆی ڕائەگرێ، بەڵام ئەو حاکمەی لە سکیایە لە فەرا میرزا حاکمتر ئەبێ. هەر چەند ئەکا هیچ چارێک نادۆزێتەوە. ناوسکی دەست ئەکا بە پێ دان و قوڕەقوڕ کردن. ئۆقرەی لێ هەڵئەگیرێ دیسان هەر چار نییە؛ خەو ئەوە هەر بە جارێ باری کرد. بێجگە لەمەش ئەیویست لەو کاتەدا هەورامانی لهۆن و ڕەزاو بدا هەر بەو شەرتە لەو بەڵایە ڕزگار بێ. بەم سەرو بەو سەری ژوورەکەدا هات و چوو ئەکاو پێچ ئەدا، لەو کاتەدا کە تۆزێک چاوی بە هەورامانی تەخت ئەکرێ چاوی بە تاقێکی ژوورەکە کەوت کە مانگە شەو لە پشت شوشەو ئاوێنەبەندی تەلارەکەوە هاتۆتە ژوورەوەو داویە لە ناو تاقەکەو بەم هۆیەوە هەندێ لە بن مێی ژوورەکەی ڕووناک کردۆتەوە. بارام سان لە بەر ئەمە دنیا شەوەو لە بەر ئەمە کە ژان و پێچی ناوسکی هیچ هۆشێکی لا نەهێشتووە، وا تێگەیشت کە ئەمە کۆلانە. بەم بۆنەوە زۆری پێخۆش بوو ڕێگای چاری دۆزییەوە.

هێنای تاکێ لە گۆرەوییە پوزەوانییەکەی خۆی وەکو بۆڕییە نووسانی بە خۆیەوە پڕی کرد. بە زیادە بەنەکەی توند شەتەکی داو دوو سێ جار وەکوو قۆچەقانی ئەسوورێنرێتەوە بە دەوری سەرا بۆ ئەوەی بەردەکە زۆر بڕوا ئەمیش سووڕاندیەوەو هاوێشتی بۆ لای کۆلانە خەیالی یەکەوە. کوتوپڕ گۆرەوی پڕ لە خەستەی ئاردە توی هەورامان و نیشاسەی پەشمەکی میوانخانەی فەرامیرزا بەو گوڕە ڕۆیشت و دای لە بن مێچەکەو تلیشیاو تەقییەوەو ژووری بلوورینی فەرامیرزای سیواغ دا.

بارام‌سان کە ئەمەی چاو پێکەوت هەناسەیەکی ساردی هەڵکیشا و لە شوێنەکەی خۆی وشک بوو؛ ئەمجا کەوتە دەریای ئەو خەیاڵەوە کە لە پێش ئەوەدا ڕۆژ ببێتەوە چۆن ئەم بن مێچە پاک کاتەوەو چۆن ئیشێکی وا بکا کە ئابرووی خۆی و عەشیرەتی نەچێ؟

پێش وەشاندنی ئەم دەستە گوڵە زۆر خەوی ئەهات، بەلام حاکمی ناوسکی نەیئەهێشت. کە لەوە رزگاری بوو ئەمجا حاکمی ئابڕوو چوون سەری لێ تێک دا بە کورتی نووستن نەما.

بەیانی زوو چووە بەر هەیوانی سێ دەریەکە کە ئەیڕوانی بە سەر کۆلانا، سەیری کرد وا کابرایەک خەریکە کۆلان گسک ئەدا. بانگی کردە لای خۆی. کابرا هات و پێی وت تۆ رۆژێ چەند وەرئەگری بۆ ئەم ئیشەت؟ [وتی] رۆژی دوو قەران. وتی شوێنم کەوە.

خۆی پێشکەوت و ئەو لە شوێنیەوە تا بردیە ژووری بلوورینی بە پیسی هەنووراو ئەسلی شوێنەکەی پیشان داو وتی من سەد قەرانت ئەدەمێ بە بێ دەنگ هەر ئێستە ئەم شوێنەم بۆ پاک کەوە. کابرای گسکدەر سەیرێکی بن مێچەکەی کرد و تێگەیشت کە چی پێوەیە، هەروا بە ساردییەکەوە وتی: «قوربان من دوو سەد قەران ئەدەم بە جەنابت هەر ئەوەندە پێم بفەرمووی چۆن ریاندووتە بەو بن مێچەدا؟»

- لەو سەرە خەتەنە سووران بوو؛ چەند منالێکیان هێنابوو خەتەنەیان ئەکردن. چەند کچێکی منالیش لەوێ بوون. لە باتی ئەوە کوڕەکان بگرین، کەچی کچەکان ئەگریان. پێیان وتن هی کوڕەکان ئەبڕن ئێوە بۆچی ئەگرین؟ وتیان: «ئەوەی کە بەوانەوەیە نووکەکانیان تیژ ئەکەن بۆ ئێمە».

- عەزیزخانیسەردار(عەزیزخانیگەورە) زۆر بە خۆشی و بە دەستووری خانەدانی پادشایی رایئەبوارد. یاسای دیوەخان و دیوەخانداری بەگزادەکانی موکری سەرمایەی هەموو قەڵەمێک بوو، عەزیزخان سەر بسقەی ئەمانە هەموو بوو. عەزیز خان چوار ژنی هەبوو، کەنیزەک و کارەکەرێکی زۆریش لە ئەندەروونا هەبوون.

رۆژێک عەزیزخان چوو بە قینا و گوێ بە دار و دەستەی ئەندەروون نەدا، وای لێ هات شەڕ لە ناو چاوی ئەباری.

عەزیز خان لەلەیەکی هەبوو «تەیموور»ی ناو بوو. تەیموور وەکو لەلە بوو، سەرو سەکوت و قسەکردنیشی هەموو کۆستکەوتوویەکی ئەهێنایە پێکەنین. ژنانی ئەندەروون پەنایان برد بۆ تەیموور وتیان ئەگەر ئیمڕۆ تۆ شتێکی وا بکەی عەزیزخان بێنیتە پێکەنین، چیت بوێ ئەتدەینێ.

تەیموور کەوتە شوێن عەزیزخانی لە ناوەڕاستی شەقامی یەکێ لە باخەکانی بۆکاندا دۆزیەوە. عەزیزخان کە چاوی بە تەیموور کەوت رووی لێ وەرسووڕاندو رووی کردە شەقامێکی‌تر، چونکە ئەیزانی کە تەیموور ئەیهێنێتە پێکەنین و ریسی ئەو رۆژەی ئەکا بە خوری. تەیموور چوو لە شەقامەکەی‌تریشا لە بەر لووتیەوە سەوز بوو. عەزیزخان چاوی خۆی داخست و لەویش لای دا. بە کورتی ئەو بۆ هەر لایەک ئەچوو ئەم وەکو مووی لووت لە بەر دەمیا بوو.

ناچار عەزیز خان لە قەراخ جۆگەیەکدا راوەستا و بە دار دەستەکەی خاکی قەراخ جۆگەکەی هەڵئەدایەوە، ئەمەشی بۆ ئەوە ئەکرد کە خۆی خەریک بکا گوێ بە تەیموور نەدا. لە ئاخرا تەیموور هەر وازی نەهێنا و تووشی بوو و پێی وت: قوربان، ئەوە لە ناو ئەم باخچەدا بە شوێن چیا ئەگەڕێی؟ عەزیزخان بە تووڕەییەوە وتی سەگباب بە شوێن هینا، بڕۆ وازم لێ بێنە. تەیمور وتی: نا قوربان، ئەبێ بزانم بە شوێن چیا ئەگەڕێی. وتی: بەد فساڵ پەنجا ساڵە گیرم خواردووە نازانی؟ تۆ ئیشت چییە بە کاری منەوە؟ وتی: قوربان نابێ هەر ئەبێ بیلێیت کە بە شوێن چیا ئەگەڕییت؟ عەزیزخان ئەمجارە زۆر تووڕە بوو، بە ئەو پەڕی تووڕەیی و دەنگ بەرزیەوە وتی: «قوڕمساغ! بە شوێن کێرا ئەگەڕێم، ئیتر قسەت ماوە؟»

تەیموور وتی: «قوربان! هەرا مەکەو لە سەر خۆت بیلێ. بە گۆڕی بەگزادەکانی موکری سوێندت ئەدەم کە لە سەر خۆت قسە بکە؛ چونکە ئەگەر ژنەکانی حەرەمسەرا بزانن لەم باخەدا شتی وا هەیە خاک و بەرد و داری بە توورەکە ئەبێژن و ئەیبەن».

عەزیز خان دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: ئەی بەڵام لە چارەتدا بۆ خۆت‌و بۆ قسەت.

- لەو وڵاتی قوروەیە دوو ماڵ لە حەوشەیەکا بوون. ئەویش هەر لە سەر کوردەواری ئەژمێردرێ. لە کوردەواریدا بە تایبەتی لە لادێکانا هێی تێدا نییە ئەگەر چەند ماڵ لە حەوشەیەکا بن. لە یەکێ لەم ماڵانەدا ژنێکی مێرداری جوانکەلە هەبوو، لە ماڵەکەی‌تریشا کوڕێکی گەنجی لاو چاک. ئەم کوڕ و ژنە سەر و سەودای دۆستایەتی و دەست سازیان پێکەوە دامەزراندبوو، بەڵام هەر چەندیان ئەکرد بۆ ئیشی خێر نەیانئەتوانی بە یەک بگەن و کوڵ وکۆی دەروونیان تۆزێ دامرکێتەوە.

رۆژێک ژنەکە بە کوڕەکەی وت: بەم جۆرە ئێمە ناتوانین بەیەک بگەین؛ چونکە بە رۆژ کە مێردەکەم لە ماڵ نییە تۆیش لە ماڵ نیت، بە شەو کە تۆ لە ماڵێت ئەویش لە ماڵە؛

کەواتە چار نییە، شەو کاتێ کە مێردەکەم نووستووە تۆ بێیت و ئیشی خۆت جێبەجێ کەیت. ئەمە لە هەموو چاکترە. ئەوەش بزانە کە مێردەکەم خەوێکی زۆر گرانی هەیە، بەلام بۆ ئەوە کە لە بەر ئەوە دنیا تاریکە منت لە گەڵ مێردەکەما لێ تێک نەچێ من سەری دەزوویەک ئەبەستم بە پەنجەی پێی خۆمەوە، سەرەکەی‌تر تۆ لە ژوورەکەی لای خۆتان کە بە تەنیشت ژوورەکەی ئێمەوەیە، بیگری بە دەستتەوە بە شارەزایی دەزووکە شەوی ئەتوانی بێیتە سەرم.

لە سەر ئەو پەیمانە خانم دەزووی بەست بە پەنجەی پێی خۆیەوەو سەرەکەی‌تری خستە مستی کوڕەی دۆستیەوە. ژنە لە کاتێکا کە لە گەڵ مێردەکەیا نووستبوو پێی مێردەکەی گیر کرد لە دەزووەکە، پرسی ئەمە چییە؟ ژنە هەروا بە سادەیی و ساردییەوە وتی: «پیاوەکە ئەڵێن هەر کەس چل ڕۆژ بەر دەرکی ماڵەکەیان بڕشێنێ و گسکی لێ دا، لە شەوی چلەمیندا خدری زیندە -ڕۆحم بە قوربانی بێ- دێتە خەوی. ئەو کەسەش ئەبێ دەزووەکی سپی ببەستێ بە پێی خۆیەوە، چونکە دەزووی سپی گزنگی فریشتەیە. ئێستە منیش ئەمە چل ڕۆژە ئەوەم کردوەو ئەم شەو شەوی چلەیە. بێ گومان حەزرەتی خدر دێتە خەوم و نیازی خۆمی لێ داوا ئەکەم. ئەم دەزوەش گزنگی فریشتەیە. تۆ خوا مێردەکە بنوو با هیچ دەنگ و سنگێک نەیەت، نە وەک حەزرەتی خدرم لێ بڕەوێتەوە.

مێردەکەی سەرەتا بەم قسەیە پێکەنینی هات، بەلام پاش ئەوە کە ژنەکەی خەوی لێکەوت، بوو بە گرێ لە دڵیا. بە هێواشی هێنای سەری دەزوەکەی لە پەنجەی پێی ژنەکەی کردەوەو بەستی بە پەنجەی پێی خۆیەوەو لە دڵی خۆیا وتی: لێگەڕێ ژنەکەم عەزیەتی کێشاوە با خێر و بیرەکەی من وەریبگرم. من و ئەو خۆ هەر یەک ماڵین، هەر خێرێکم لە خدری زیندەوە دەست کەوت، دیارە ژنەکەشم تیا هاوبەشە. لە بەر ئەوەش کە دنیا هاوین و گەرم بوو، ئەویش وەکو ژنەکەی تەنگەی خۆی لێ کردەوەو بە رووتی لێ نووست.

ئەمجا لەو لاوە کوڕەی خانمباز -کە ئاگرێ بە یەک گەیشتن لە گەڵ دۆستیا هەڵی گرتبوو- ئەو شەوە هیچ خەو نەچووە چاوی. دەقیقەیەکی بە ساڵی لێ ئەڕۆیشت. کە کەوتە پاش نیوەشەو بە هێواشی هەستا، بە دڵەکوتێ و دڵەتەپێ بە هەر جۆر بوو خۆی گەیاندە ئۆدەی ژنەکە. بە شارەزایی دەزووەکە هات تا گەیشتە سەر پێی کابرای مێرد. دنیاش تاریکە نازانێ، لای وایە ئەمە پێی ژنەکەیە؛ چونکە پەیمان وابووە. کابراش لە پەورۆ کەوتبوو، کوڕە ویستی خەبەری کاتەوە بۆ ئەوە ئیش و کار لە شوێنی ڕەسمی خۆیەوە بڕوا بەلام لە ترسا کە ئەم خەبەر کاتەوە مێردەکەشی خەبەری بێتەوە بە ناچاری هەر لە دواوەوە پەڕیە کۆڵ

کابرای ئەو بە ژن زانیوەوەو لیێ توند کرد. کە ئەم لیی توند کرد، کابرا خەبەری بوەوەو بە دەنگێکی بەرزی بە ترس وتی: «یا حەزرەتی عەباس! یا حەزرەتی عەباس!»

کوڕی بەدبەخت کە لە یەکەم شەوا بووکی بە نێر بۆ دەرچوو، حەپەساو راچەنی، هەر ئەوەی پێی کرا دەری هێنا و بەرەو دوا پێی لێ کرد بە پشتا.

لە هەراو نالەی کابرا ژنەکە بە خەبەر هات و پرسی مێردەکە چی بوو؟ بۆچی هاوار ئەکەی؟ کابرا لە بەر ژانی دوای دەنگی خاو بوو بوەوە بە نوزەیەکەوە وتی: «هیچ، هیچ ئەگەر حەزرەتی عەباس نەگەیشتایەتە فریام، خدری زیندە -رۆحم بە قوربانی بێ- هەموو دەور و بەری کۆمیمی پارچە پارچە ئەکردەوە.»

- کابرایەک لەو دەشتە لەسەر پێشاو دانیشتبوو. دەوروبەرەکە رەزبوو. شەنگە سوورەیەک هات و دای بە دەعباکەیەوە. تا هاتەوە بۆ ماڵەوە دەعبا بوو بە قەد کوندەیەک. پیشانی ژنەکەی دا ژنە وتی: ئەمەت لە کوێ هێناوە؟ کابرا لە دڵی خۆیا وتی ئاش لە خەیاڵێک و ئەشەوان لە خەیاڵێک. وتی بە خوا ژنەکە ئەوی راستی بێ هێنەکەی خۆم و دە لیرەم باقی داوەتەوە ئەمەم لە کابرایەک وەرگرتووە. بەڵام ئێستە پەشیمانم؛ چونکە دە لیرەکەم هەزار کاسپیم پێوە ئەکرد. ژنە وتی: هیچ پەشیمان مەبە، ئەگەر لە هەموو عومری خۆتا معامەلەیەک باشت کردبێ هەر ئەم معامەلەیە بووە. منیش هەر ئێستە دە لیرەکەت ئەدەمەوە. هەر خێرا هەستا چوو ئەم چەند ساڵە چ پارەیەکی بە پوولە پوولە لە مێردەکەی دزی بوو، هێنای. کە سەیری کرد لە باتی دە لیرە، یانزە لیرەشە، کردیە دەستی مێردەکەیەوەو وتی ئەوا لیرەیەکیشی زیادە بۆ تۆ باشە ئیشێکی پێوە ئەکەی. لە پاش سێ چوار رۆژ کابرا وانیکەکەی چاک بوەوەو ناو ساویکەی نەماو وەکو خۆی لێ هاتەوە. ژنەکە بە تووڕەییەکەوە وتی: ئەوە ئەو دەعباکەی کڕیبووت چی لێ هات؟ کابرا وتی: ژنەکە دەنگ مەکە ئەمە خۆ بە ماڵی دزیەتی دەرچوو خاوەنی بۆ پەیدا بووەوەو لێیان وەرگرتمەوە. ژنەکە وتی: «کەواتە بڵێ ئەمە ماڵی دزیەتی بوو کەوا بەو هەرزانیە کەوتبوە دەست؛ ئەگینا ئیمڕۆ ئەو جۆرە شتە بەو نرخانە چۆن ئەدەن بە ئەوەندە پارە. بزانە ئەگەر جارێکیکە شتی وات دەست کەوت نەیەڵی خاوەنەکەی پێ بزانێتەوە».

- ئاخونێک لە «سونگر» رەوزەی ئەخوێند لە ناوەندی رەوزەکەدا وتی: «حەزرەتی ئەمیر فەرموویەتی هەر کەسێ بەچە بازی بکا ئاوی کەوسەر لە دەستی من ناخواتەوە.

کابرایەک کە لە بەر دەمیا دانیشتبوو بە دڵ گوێ بۆ ڕەوزەکەی شل کردبوو، هەر هەڵساو پێ وت: «قوربان! لە زمانی منەوە سەلام بکە لە حەزرەتی ئەمیرو عەرزی بکە ئەگەر مەسەلە وایە ئاوی حەوزی کەوسەر خۆتان و هەر یانزە ڕۆڵەکەتان تێکەن و بیخۆنەوە».

- شەڕی دووەمی گێتی بوو. هەم هەموو شتومەکێک گران بوو، هەم لەشکری حوکومەتەکان بە هەموو لایەکا بڵاو بووبوونەوە. هەندێ سەربازی پۆلۆنی بەهۆی گەرمەی شەڕەوە کەوتبوونە کەرکووک. زابتێکی پۆلۆنی لە گەڵ ئافرەتێکی گەڕیدەی شەڕا ڕێ ئەکەوێ. قسەیان لە سەر ئەوە ئەبڕێتەوە کە کابرا جارێک بە خزمەتی ئافرەتەکە بگا و دە دیناری بداتێ، بەلام بە مەرجێک کە پێنج دیناری پێشەکی بێ و پێنجەکەی تری دوای تەواو کردنی کلاوەکە. لە سەر ئەم بڕیارە پێنج دینارە پێشەکیەکەی داو خرایە جەحەنەمەوە. بەلام کابرا لە پاش ئەوە کە لە ئیشی خۆی بووەو دەستی کرد بە ملپێچی کردن لە دانی پێنج دینارەکەی تر؛ بە کورتی نەیدا.

مەلاسدیقی‌نازەنینی حاکم بوو لە کەرکووک. ئافرەتەکە ئەچێ شکات ئەکاو بەم جۆرە سکالا نامەیەک ئەنووسێ: «سەرۆکی دادگای بەڕێز! جەنابی مسیوپۆلۆتارک ژوورێکی لەم کارەکەرەی خۆت گرتووە بە دە دینار کە پێنج دیناری لە پێش ئەوەدا بێتە ناو ژوورەکەوە بیدات و پێنج دیناریشی پاش ئەوە کە ژوورەکەی وەرگرت. جەنابی مسیو لە پاش ئەوە کە پێنج دیناری پێشەکیەکەی دا ژوورە مڵکە تایبەتیەکەمی وەرگرت؛ بەلام بە پێچەوانەی پەیمانی بەینمان لە دانی پێنج دینارەکەی‌تر روو وەرئەگێڕێ.

لە بەر ئەمە ئەم کارەکەرەی خۆت تکا ئەکا کە بۆ وەرگرتنی پێنج دینارەکەی‌تر لە جەنابی مسیو، ئەوی شایانی دادو عەدلە بەجێ بێنن بۆ ئەوە ئەم دوعاگووە داوێن پاکە دڵسووتاوە هەتا زەمانێکی دێرینە منەتباری ئێوەو دادگاتان بێت. کارەکەرتان ج».

مەلا سەدیق لە پاش ئەوە ئاگاداریەی پەیدا کرد، بە سەر مەسەلەو سکالا نامەدا بە فەرمانێک مسیو پۆلۆتارکی بانگ کرد بۆ دادگا بۆ ئەوە چی لەم ڕووەو ئەزانێ خۆی پێی بپەرێنێتەوە. مسیو پۆلۆتارک لە ڕۆژی تایبەتیدا هاتە دادگاو وتی: جەنابی دادپرس! من بە دوو بەڵگە پێتان ئەسەلمێنم کە ژووری ئەم خاتونەم وەرنەگرتووە. خاتونیش لەو لاوە ڕاوەستاو بوو. هەر داوایەک کە لەم ڕووەوە ئەیکا من ئەیگێڕمەوەو ناچمە ژێری. دوو بەڵگەکە یەکێکیان ئەوەیە کە ئەم ژوورە لە تەنیشت ئاو دەستخانەوە بوو، دووەمیان ئەوەیە کە شێی هەڵهێنابوو ستاری تیا نەئەکرا. بەم بۆنەوە تکا ئەکەم داواکەی بگێڕنەوە.

مەلا سەدیق زەردەخەنەیەک گرتی و وتی: «جەنابی پۆلۆتارک بەڵگەکانت لەوانە نین کە داواکەیان پێ بگێڕیتەوە؛ چونکە ئەمە ئاشکرایە کە ئێستە زەمانی جەنگەو کرێ ژوور زۆر گرانە. دە دینار شتێکی وا نییە کە پیاو بتوانێ ژوورێکی نایابی پێ بە کرێ بگرێ. دیارە مەگەر هەر ژوورێک بێ بە دە دینار کە لە تەنیشت ئاو دەستخانەوە بێت. دووەم ئەم ژوورە کە تۆ گرتووتە شێدار و مەرتووب نەبووە، ئەمەش بەوەدا ئەزانرێ کە جەنابتان هەر لە گەڵ چوونە ناویەوە هەموو کەلین و قوشبنێکتان ئاو پاشی کردو رشاندتان. بێ گومان ژوورێک کە شێدار بێت ناشێنرێت. سێیەم ئێوە هەموو ژوورەکەتان گرتۆتە دەست؛ چونکە هەر شتێکتان هەبووەو نەبووە خستووتانەتە ناوی، تەنانەت بە هۆی ئەوەوە کە هەموو ژوورەکەتان داگرتووەو پڕتان کردۆتەوە، دووبالتان پێ بووە جێیان نەبووەتەوە لە بەر دەرگاکەدا بەجێتان هێشتوە». لە ئاخرا دادگا حوکمی دا بە سەر پۆلۆتارکا بە پێنج دینارەکەی‌تر و خاتوو «ج» بە سەرکەوتوویی لە دادگا چووە دەرەوە.

- حەمەی‌کوێخاخدری‌داربەروولە هەبوو؛ لە زەمانی تورکەکانا عەسکەر بوو. ئەم حەمەیە بە دەم عەسکەریەکەوە کاسبیەکیشی بۆ خۆی دۆزیبووەوە کە پێ بژیت. کاسبیەکەش ئەوە بوو «گرەو»ی لە گەڵ خەڵک ئەکرد لە سەر پارە زۆرتر وەخت گرەوەکەی ئەبردەوەو پارەکەی وەرئەگرت. لەم رێگایەوە بۆ خۆی پارەیەکی باشی پێکەوە نابوو بەڵام هەموو سەربازی فەوجەکەی خستبوە سەر ساجی‌عەلی.

فەرماندەری فەوجەکەی یووزباشیەک بوو. ئەم یوزباشیە بە تەواوی بە تەنگ هاتبوو بە دەستیەوە. بە لێدان، بە حەپس کردن، بە هیچ شتێک چاری نەئەکرد. ئاخری دێتە سەر ئەوە کە لە فەوجەکەی خۆیا نەیهێڵێت و بینێرێتە لای یەکێ‌تر. بەم بۆنەوە ئەنووسێ بۆ بین باشی کە ئەم کابرایە لە لای ئەو نەیەڵێ. بۆی ئەنووسێ: «سەربازێکمان لایە هیچ ئیش و کاری نییە گرەو کردن نەبێ و هەموو سەربازەکانمانی لات کردووە. هەر چەندە لێئەدەم و حەپسی ئەکەم واز نایەنێ وە زۆرتریش لە گرەوەکانیا هەر ئەیباتەوە؛ تەنانەت تا ئێستە دوو سێ جاریش لە گەڵ من کردوویەتی و لێ بردوومەتەوە. وام لێ هاتووە هیچ پارەی بە دەستەوە نە هێشتووم. تکا ئەکەم لە لای ئێمە هەڵیگرن و بیخەنە شوێنێکیکە».

ئەم نووسراوە ئەنێرێ بۆ بین باشی. بین باشی کە ئەیخوێنێتەوە لەمە تووڕە ئەبێ و بە تەلەفۆن بە ویز باشیەکە ئەڵێ هەر ئێستە ئەو کابرایە بنێرە بۆ لام و با لای خۆم بێت، دیارە

ئێوە ناتوانن تەمێ بکەن وە یا ناتوانن لەشکر بەخێو کەن؛ ئەگەینا چۆن شتی وا ئەبێ؟ ئەبێ تا ئێستە ئەو کابرایە گوێ لە شریخەی شەلاخ نەبووبێ.

لە سەر ئەم فەرمانە حەمەی‌کوێخاخدر ئەنێرێ بۆ لەشکری بین باش و ئەچێ لە بەردەم فەرماندەدا تەق سەلامێکی سەربازی دائەکوتێ و ئەڵێ: قوربان من سەربازی لەشکری یەکەم حەمەی کوێخا خدرم.

فەرماندە ئەڵێ: سەگباب بۆچ لە لەشکری یەکەمدا گرەوت ئەکرد و ئەتبردەوە؟ئەڵێ: قوربان من چی بکەم، ئەوان گرەویان لە گەڵ ئەکردم و منیش ئەمبردەوە. بەختم هەبوو لە گرەودا.

فەرماندە ئەڵێ: گووت خوارد، بەختم هەبوو چییە؟ ئێستە تەشریفت بڕوا تا ئەگەمە خزمەتت.

حەمەی کوێخاخدر لەو کاتەدا کە ویستی سەلام بگرێ و بگەڕێتەوە دواوە، کوتوپڕ بە فەرماندەی وت: قوربان وا تێ بگەم جەنابتان مایەسیریتان هەیە.

بین باشی وتی: سەگباب! گوو مەخۆ. ئەم فلتەفلتە چییە؟ من لە ژێر چاوێر پزیشکی تایبەتی دام؛ هیچ دەردێکم نییە، نە مایەسیریم هەیە نە شتێکی‌تر.

حەمە وتی: قوربان من گرەوت لە گەڵ ئەکەم کە ئێوە مایەسیریتان هەیە، بە ڕەنگتانا دیارە. فەرماندە وتی: سەگباب! دیسان دەستت دایەوە بە گرەو کردنەوە؟

حەمە وتی: بەڵێ قوربان گرەو ئەکەم، گرەو ئەکەم لە سەر پەنجا لیرە کە جەنابتان مایەسیریتان هەیە.

فەرماندە زۆر تووڕە بوو هەر قسەکەی حەمەی ئەگێڕایەوە: پەنجا لیرە، گرەو ئەکەم لە سەر پەنجا لیرە... گرەوم لە گەڵ ئەکا لە سەر پەنجا لیرە! تەواو، تەواو.

لە پاشا لە دڵی خۆیا فیکری کردەوە وتی خۆ من مایەسیریم نییە، ئەگەر بێتوو گرەویشی لە گەڵ نەکەم لە چەند لاوە خراپە رووم تێئەکا: یەکێ ئەم سەربازە ئەگەر گرەوی لە گەڵ نەکەم لەناو لەشکرەکەدا بلاوی ئەکاتەوە کە من مایەسیریم هەیە؛ یەکێ پەنجا لیرە گالتەی لە گەڵ کرێ مانگانەی دوو مانگمە. من کە ئەزانم مایەسیریم نییە بۆچ ئەم گرەوە نەکەم؟ یەکێکی‌تر ئەوەیە کە لە هەموو زیاترە کە من ئەم سەگبابە گرەوی لە گەڵ بکەم و لێ بەرمەوەو بە یووزباشی فەرماندەی لەشکری یەکەم بسەلمێنم کە ئەم سەربازە گوویەکی وا نییە. ئەو سەربازەی کە لە لەشکرەکەی ئەوا پاڵەوان بوو، هەر کە هاتە لەشکرەکەی منەوە من خۆم لێم بردەوە.

بین باشی کە ئەم شتانەی هەموو لێکدایەوەو کە سەیری کرد هەمووی قازانجی خۆیەتی، بە سەربازەکەی وت، بچۆ پزیشک بێنە تا تەماشام بکا، من ئامادەم بۆ ئەوە ئەم گرەوە بکەم. حەمەی‌کوێخاخدر وتی: قوربان! پزیشکی ناوێ، مایەسیری دوو جۆرە یەکێ تەڕەو خوێنی هەیە، یەکێ وشکەو دوگمەی هەیە. من خۆم چاکی لێ ئەزانم فەرموو دەرپێکەت داکەنە خۆم تەماشاتان ئەکەم؛ چونکە دەستی حەکیمیم هەیە.

بین باشی حەمەی‌کوێخاخدری بردە ژووری تایبەتی خۆیەوەو دەرپێکەی بۆ داکەند. حەمە پەنجەی خۆی تا بن کرد بە قنگی فەرماندەداو دەری هێنایەوەو وتی: قوربان هەر چەند سەیرم کرد ئێوە بە هیچ جۆر مایەسیریتان نییە، گرەوەکەم دۆڕان، فەرموو ئەمە پەنجا لیرەکە. خێرا دەستی برد پەنجا لیرەکەی لە بەر دەم فەرماندەدا دانا.

بین‌باشی بە خۆشی‌خۆشی دەرپێکەی هەڵکیشایەوەو پەنجا لیرەکەی خستە تەنکەی باخەڵی و هاتە ژووری ئیدارە دەستی دایە تەلەفۆن و قسەی لە گەڵ یووزباشی فەرماندەی لەشکری یەکەم کرد و وتی: هەی بێ مێشک بە راستی راستە کە هیچ ئیدارەت نییە. ئەم سەربازە خوێڕیە کە ناردبووت لە ماوەی دە دەقیقەدا پەنجا لیرەی بە من دۆڕان و چاوم شکاند کە جارێکیکە گرەو لە گەڵ کەسا نەکا.

یووزباشی وتی چۆن؟ بین‌باشی وتی: پێی وتم کە تۆ مایەسیریت هەیەو لە سەر پەنجا لیرە گرەومان کرد، وە خۆی بە هەموو ئارەزووی خۆی پەنجەی کرد بە منا. کە سەیری کرد هیچ مایەسیریەکم نییە جوان و پوخت پەنجا لیرەکەی دانا و ئاقڵ بوو بۆ جارێکیکەش کە ئیتر گرەو نەکات.

لەم کاتەدا یووزباشی فەرماندەی لەشکری یەکەم لە پشت تەلەفۆنەکەوە بە حەپەساویەکەوە وتی: ئاخ پشتم شکا! بین‌باشی وتی چی بوو؟ یووز باشی فەرماندەی لەشکری یەکەم وتی: ئەم سەگبابە چەندە فێڵباز و دەستتەڕە. لە گەڵ منا لە سەر دووسەد لیرە گرەوی کردووە کە من ئەو بنێرم بۆ لەشکری ئێوە بە گەیشتنە پێشەوەی پەنجەیەک بکا بە قنگی فەرماندەدا کە جەنابتانن. من وتم کە ناتوانی ئەو وتی تۆ گرەوم لە گەڵ بکەو بمنێرە، ئەگەر بین‌باشیم بە پەنجەیەک تاقی نەکردەوە تۆ دوو سەد لیرەی خۆت وەربگرە. ئەوا ئێستە وا دیارە دەستی خۆی وەشاندووەو پەنجەی کردووە بە قنگی جەنابتانا دوو سەد لیرەکەی لە من بردۆتەوە، پەنجا لیرەی داوە بە جەنابتان و خۆیشی سەد و پەنجا لیرەی ماوەتەوە. بین‌باشی دەستی سارد بووەوە تەلەفۆنەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە.

- ئەو ساڵە قائمقامێک لە چوارتا هەبوو کە یەکەم جار بوو چوارتا قائمقامی تێ‌ئەچوو، وە یەکەم جاریش بوو ئەو کابرایە ئەبوو بە قائمقام.

مدیری ماڵ «میرزامارف» بووە، ڕۆژێک لە ئاخری مانگا لیستەی ئەو مانگەی دایەرە بەمجۆرەی خوارەوە ئەنووسێ و ئەیبا بۆ قائمقام ئیمزای بکا و بینێرن بۆ سولەیمانی:

لەوازمی نووسین ۲۰۰ ڕوپیە. سووتەمەنی ۱۰۰ ڕوپیە. تەعمیرات ۱۰۰۰ ڕوپیە. مەعاشی ئەهلی دایەرە ۲۰۰۰ ڕوپیە. جەمعی کول ۳۳۰۰ ڕوپیە.

قائمقام سەیریکیان ئەکا و ئەڵێ لەوازمی نووسین تەواوە ۲۰۰ ڕوپیە، سووتەمەنی تەواوە ۱۰۰ ڕوپیە. تەعمیرات تەواوە ۱۰۰۰ ڕوپیە. مەعاشی ئەهلی دایەرە تەواوە ۲۰۰۰ ڕوپیە. ئەمجا چاوی ئەکەوێ بە جەمعی کول- ۳۳۰۰ ڕوپیە- تووڕە ئەبێ و ئاگری تێبەر ئەبێ ئەڵێ: ئەم جەمعی کولە سەگبابە کێیە کە هەر مانگێک ئەوەندە پارە لەم دایەرەیە وەرئەگرێ؟ و من تا ئێستە ڕێ نەکەوتووە جارێک بەرچاوم بکەوێ؟

ئەمجا کاتبی تحریر بانگ ئەکاو ئەڵێ: «لە ئێستە زووتر نییە ئەم جەمعە کولە سەگبابە فنش کەو ئیتر پووڵێکی‌تری مەدەنێ، وەرەقە فنیشەکەیم بۆ بێنە ئیمزای کەم».

- ژنێکی روغزایی هەبوو «میمکە ئەفرۆز»ی ناو بوو. ساڵێک لە گەرمیان گڵیان خواردبووەوەو نەچوو بوون بۆ کویستان. سەگێکیان هەبوو هاتبوە «با». میمکە ئەفرۆز ئەچوو بە لایەوە ئەیوت: «ها سەبۆر گیان نەدەی وە سەگی گۆرانی کولە جۆ تاک تاکێک بدە وە سەگەکەی حەمەجان قەیناکا لە خۆمانە».

- شێخ فەتاح مەلای خێڵی حەمەسەنی تەرخانی بوو لە رەمەزانا. مەلا کاکەحەمەش هەر لەو رەمەزانەدا مەلای خێڵی ڕۆستەمی ئەحمەد بوو. شێخ فەتاح بۆ بانگ و سەلا دەنگێکی خۆشی هەبوو، بە پێچەوانەی ئەو مەلا کاکەحەمە دەنگی زۆر ناخۆش بوو. دەنگی شێخ فەتاح ئەچووە خێڵی ڕۆستەم و هەموویان گوێیان لێ ئەبوو. پیرێژنێکی خێڵی ڕۆستەم کوتوپڕ کە مەلا کاکەحەمە ئەبینێ و سەلا ئەکا، روو ئەکاتە چەند پیاوێک کە دانیشتبوون ئەڵێ: «مەلا، مەلای خێڵی حەمەسەنە؛ دەنگی وەک نێرەکەر تێت. مەلاکەی ئێمە ئێژی سەگەنازی گزنگە هەر قرخە قرخیەتی. وە کەلامی خوا ئەوێ سەر فترە بدەین وەو».

شەوی دوایی شێخ فەتاح -کە ناوی خۆی بیستبووەوە- چاکتر تێی چریکان بۆ سەلا کردن. مەلا کاکەحەمەش لەو کاتەدا ئەویش سەلای ئەکرد، پیرێژنێکی‌تر کە گوێی لە دەنگی

هەردووکیان بوو چووە بەر لوتی مەلا کاکەحەمەو پێ وت: «بیوڕەوە، بیوڕەوە مەلا، هەی کێری مەلاکەی خێڵی حەمەسەن وە قنگم بۆ مەلام. بیوڕەوە بێ فەڕ. هەر قرخە قرختەس وە کەلام خوا ئەوی سەرفترە بدەین وەو».

- هەر ئەم شێخ فەتاحە لە گەڵ «شێخ‌کاکەحەمەی‌ناوە» ئەچن بۆ ناو جاف بۆ دەرویش گرتن. ئەگەنە قەراخ خێڵێک و دێن بە پیریانەوە. پیرێژنێک حاڵی لێ دێت و رووی ئەکردە شێخ و ئەیوت: «هۆ! وە قوروانت وم شێخە چاو حیزەکە هۆ».

- خێڵ ئەگەڕانەوە بۆ گەرمیان لە «تاریەر»ژنێک گاکەی ئەگلی و ئەڕوا. ژنە هاوار ئەکاتە غەوس هیچ کەڵکی نابێ. پاشان بانگ ئەکاتە شێخ کەریمی کەسنەزان لەو کاتەدا کوتوپڕ گا گیر ئەکا لە پنچکێک و ئەگیرسێتەوە. ئەمجا ژنە ئەیوت: «های وە قوروانت وم کەریمە سووری کەسنەزان! کلکی گرت و تڕی بڕی».

- خێڵ سەرەو ژوور ئەبوەوە بۆ کوێستان. کابرایەکی «باشکی» دانی سوڵەسوڵی ئەکرد وتی تا دەستم لە گەرمیان نەبڕیاگە با بیکێشم. چووە «کفری»و چووە لای کابرایەکی ناڵبەند وتی: ئا برا ئەو دگانەم بۆ بکێشە. کابراش پەتێکی هێنا سەرێکی بەست بە ددانی کابراوەو سەرەکەی تری بەست بە کۆڵەکەی دوکانەکەیەوە، ئەمجا چوو بزێکی کرد بە کابراوە. کابرا تەکانێکی دا هەڵبێت، دانەکەی بە پەتەکە مایەوە. ئەمجا دوور کەوتبووە ئەیوت: «سەیرکە دەوێت باوکە ئێژی سەری دگانەکە لە دەممایەو ریشەکەی لە قنگمایە وا بزم پێوە ئەکا».

- مەلاسەعیدی‌هەورامی وتی لە گەرمیان لە خێڵێکی باشکی مەلای رەمەزان و لە ماڵی حەمەلاوی باشکی بووم. حەمەلاو دوو ژنی هەبوو، گەورەکەیان «ئامە»ی ناو بوو. ئەو رەمەزانە حەمەلاو هیچی پێ نەکرابوو، کەوتە دەمەدەمی جەژن لە رۆژی عەرەفەدا ئامە گۆیا ئەچێتەوە بۆ ماڵی باوکی بۆ ئەوە جەژن لەوێ بکا، حەمەلاو بە هەڵی ئەزانی ئەچێ بەرۆکی ژنە بچکۆلەی ئەگرێ ئەڵێ کچێ ئامە لێرە نییە با خەریک بین. مەلایش خۆمانە تا ئامە لێرە نییە دەستێ ئەوەشێنین.

کە حەمەلاو و ژنەکەی خەریکی ئیش ئەبن، ئامە لە پێشا دڵی چەکەرەی کردبوو خۆی لێیان داگرتبوو، لەو کاتەدا ئەچی بە سەریانا. حەمەلاو هەر خێرا جامانەکەی رائەخات و دەست ئەکا بە نوێژ کردن. ئامە ئەچێ بە جنێودان تێ بەر ئەبێ و ئەچێ چاکی کەواکەی هەڵ ئەداتەوە سەیر ئەکا حەیتە مل دابڕیاگەی جارانی خۆی لە ژێر کەواکەوە بەلە بەلیەتی. ئەڵێ: «حەمەلاو درۆزن رووی باوکی رەش وێ، ئەمە کێری تەحیات و نوێژ کردنە؟ تۆ خوا مەلا تۆ پیاوێکی وە تەحیاتی، بۆ خوا قسە بکە ئا ئەم کێرە کێری تەحیاتە؟»

مەلاسەعید وتی ناچار منیش دامە پاڵی وتم: «نەوەڵلا کێری تەحیات وا بەلە بەلکەر نییە».

- «سالحکچانی»[21] هەبوو لە کفری باوکی ئەم حاجیشاسواریکچانیە؛ بازرگان بوو. رۆژێک کابرایەکی جاف -کە ناسراوی سالح ئەبێ- ئەچێتە ئەوێ و ئەویش میوانی ئەکاو ئەیباتە ماڵەوە. کابرای جافە گایەکی پێ ئەبێ لە بەیانیا گاکە لە بازاڕ ئەفرۆشێ و سالح ئەکا بە دەستەبەر کە ئەم گایە دزیەتی نییە. پارەی خۆی وەرئەگرێ و ئەگەڕێتەوەو خێڵ و ئەچێ بۆ کوێستان. لەم لاوە گا بە دزیەتی دەرئەچێ جوان و پوخت لالۆ سالح ئەگرن پارەی گاکەی لێ ئەسێننەوە.

خێڵ لە کوێستان ئەگەڕێتەوەو کابرا هەمانەیەک «کەشک» هەڵ ئەگرێ دێت بۆ کفری. هەمانە کەشک ئەفرۆشێت و بۆ ئێوارە دێتەوە بۆ لای لالۆ سالح وەکو نە بای دیبێ و نە بۆران. لالۆسالحیش هیچ نایخاتە رووی هەر وەکو جاران قسەی خۆشی لە گەڵ ئەکاو ئەیباتەوە بۆ ماڵەوە.

دنیا پایزە، لالۆ سالح ئەڵێ نیسکێنەیەکی سوێری گۆرانانە لە ماڵەوە دروست ئەکەن. شەوی دوو قەرەوانەی چاک نیسکێنە دائەنێن، کابرا هەتا لە لووتی دێتەوە نیسکێنە ئەخواو پاشان خۆی بە تەنها لە ژوورێکا ئەنوێ و دەرگای دەرەوەی ژوورەکەی لە سەر دائەخرێ. ئەکەوێتە نیوەشەو کابرا حەلوەلای پێ ئەکەوێ هەڵئەستێ دەست ئەنێ بە دەرگاکەوە، سەیر ئەکا لەو دیوەوە داخراوە. هیچ چاری نامێنێ هەمانە خاڵیەکە دینی و تێ ئەڕێنێ. بەو جۆرە لە سەری ئەڕوا تا بەیانی پڕی ئەکاو هەر جارەش ئەڵێ: بکەم وە گۆڕ باوکتەوە گۆرانە هێزە».

---

٢١- کچان دەبێتە کەلەسەنگاو.

لەو لاشەوە هەر سەر لە ئێوارەوە سالح بە دوو جامبازی خەڵکی کفری ئەڵێ میوانێکمان هاتووە هێزەیە، ڕۆنی نایابی پێیە. بەیانی جامبازەکان لە گەڵ مەلا بانگدانا ئەکەونە جامبازەو بەرقاپی ماڵی لالۆ سالح ئەگرن. کابراش هەر لە تاریک و لێڵەدا هەڵئەستێ لە تەریقیانا هەمانە گوو ئەدا بە کۆڵیا و دێتە دەرەوە. هەر کە دێتە دەرەوە جامبازەکان قیڕ ئەیگرن.

جامبازی ئەو سای کفریش وەکو تانجی ڕاوی چۆن نێری دەستکەوتایە بەرەڵای نەئەکرد، ئەمانیش بۆ کورد و کارەی دەرەوە ئاوا بوون. هەمانە ئەگرن و ئەڵێن ئەم ڕۆنەت بە چەند؟ کابراش ئەڵێ ڕۆن نییە لێم گەڕێن. ئەوان تازە نێچیری خۆیان دەستکەوتووە بەرەڵا کردن هەر نییە. هەر ئەڵێن ئەبێ لێت بسێنن و ئەمیش هەر ئەڵێ نایفرۆشم. لە ڕوویشی هەڵنایە بڵێ گووە. ئەوان هەمانە ڕائەکێشن و ئەم ڕایئەکێشێ و ئەڵێ بکەم وە قنگ دایکتانەوە بەرەڵای کەن با بڕۆم، بە جێ مام. لەم مرو مشت و بگرەو بەردەدا پشکی هەمانە بەر ئەبێ و -شەرووەت وێ لە رووتا- گووی لە نیسکینە دروست بوو هەموو سەر و چاوی جامبازەکان ئەشواتەوە.

دیارە لەم هەراو هوریایەدا دنیا بە تەواوی ڕووناک ئەبێتەوەو ئەبێ بە ڕۆژ. خەڵکی دائەبارین. جامبازو کابرای جافە ئیش لەوە ئەترازێ کە بە شێنەیی لە گەڵ یەک بزوونەوە. ئەوان ئەم ئەدەنە بەر شەق و پاشماوەی پیسایی لە سکیا مابوەوەو هەمووی هەڵئەڕژێتە ئەو ناوە. ئەمیش بە گالۆکەکەی دەستی و بە هەمانەی بن دەستی ئەوەندەی‌تر ئەوان ئەشواتەوە. لالۆسالحیش وەکو خەڵکی‌تر دێت لەو لاوە سەیر ئەکا.

جامبازەکان جنێویان ئەدا بە لالۆ سالح بۆ ئەو ڕۆنە چاکەی بۆیانی دۆزیویەتەوە. کابرای کوردەش هەر جنێوی ئەدا بە لالۆسالح بۆ ئەم میوانداریەی کە کردی. ئەوان لەو ناوەدا بەو جۆرە یەکتریان سەگ کوژ کرد. کابرای کوردە بە هەر جۆر بوو نیوە گیانێکی دەرکرد و چووەوە ئیتر لە تەریقیا جارێکیکە ڕووی نەکردەوە بە کفریا. لالۆسالح ڕزگاری بوو لە دەستی.

- کچێکی ئەو عەشرەتە خەوی دی بوو بۆ دایکی گێرایەوە وتی: «دایە لە خەوما چتێکی سووری مل داوڕیاگ لە ناو گەڵما کەفی ئەچەران». دایکی چەپۆکێکی دا بە سەریا و وتی: «وەی ڕۆڵە باوانت شێوگێ نەیان گاویتی؟» کچە وتی: «دایە ئەوە تۆ بێژی چی؟ گان وا ناوێ بۆچی تۆ وا ئەزانی من نەم دیگە؟» وتی: ئادەی بێژە. کچە وتی: «لە هەوارگە

خوارگەی کوێستان گوڵەی کوڕی حەمکی حەمەجان لای ڕان وەستابوو گاڵۆک لە سەر شان، کەوتە سۆزەوە دنیای ئەسووتان. هات وە لامەوە وەک دزی گۆران. قریوەیەکی کرد و شانی هەڵتەکان، کە نای وە درگای کوسمەوە قنگم وتی فیڕ فێنگ».

- ژنێک هەبوو «باجی سەمەن»ی ناو بوو، تەغاریٚ شووی کردبوو. شوویەکی‌تری خستە سەر، بوو بە ۳۱. ئەو شەوەی گواستیانەوە بۆ مێردی سی و یەکەمین، دەستی کرد بەگریان و نووکە نووک. پێیان وت ئەم گریان و نووکە نووکەت لە چییە خۆ تۆ وە نە بیٚ ئەمە یەکەم شووت بیٚ؟ وتی: «بەڵیٚ وایە بەڵام ئەمە بۆ ئەوەیە کە ڕەوشتەکە تێکنەچێت».

- شاخێک هەیە لەو خۆشناوە شاخی «تف لە دەست»ی پێی ئەڵێن. ڕۆژێک هەندیٚ لە کوڕ و کاڵی خۆشناو ئەچن بۆ ئەویٚ و ئەکەونە دەمەتەقیٚ کە شاخەکە بپێون. هەندێکیان ئەڵێن بە گوریسان بیپێوین. هەندێکیان ئەڵێن بە داران بیپێوین. پیاوێکی زۆر دانایان تیا ئەبیٚ ئەڵیٚ: وا نابیٚ بابم. بە زەلامان بیپێوین؛ بۆ ئەوە بزانین چەند باڵا پیاوە. هەموو ئەڵێن قسە ئەمەیە کە حەمەدیٚ ئەیکا.

حەمەد ئەچێتە سەر شاخەکە دەست بە لووتکە بەردێکەوە ئەگریٚ خۆی شۆڕ ئەکاتەوە، یەکێکی‌تر ئەچیٚ دەست بە قاچی ئەوەوە ئەگریٚ و ئەویش خۆی شۆڕ ئەکاتەوە بەو جۆرە حەوت هەشت کەس وا ئەکەن. حەمەدیٚ لە سەرەوە باڵی وەختە بپچڕیٚ بانگ ئەکا: «ڕحمەتوو لیٚ بیٚ دەستان توند بگرن تف لە دەستی خۆ دەکەم». ئەمە ئەڵیٚ و دەستی لە لووتکەی شاخەکە بەرەلا ئەکا بۆ ئەوە تف لە دەستی خۆ بکا. کە ئەوە ئەکا هەموو زرم ئەکەونە خوارەوە هەپروون بە هەپروون ئەبن.

- مەلاعەبدولسەمەدیهەجیجی هەبوو، سەردەمێک فەقێیان ئەچوون لایان ئەخوێند. عیلمی مەنتیق لە ناو فەقێیانا زۆر باوی پەیدا کرد و کتێبی «گلبنوی برهان»کەوتە بڕەو. فەقیٚ ئەوەندە ڕوویان نەئەکردە ئەو بۆ خوێندنی مەنتق و بۆ ئەو کتێبە ئەچوونە لای «سەیدی چۆڕ»و لای پیاویٚ وەکو ئاغا محەمەد ئەیانخوێند و توخنی مەلاعەبدولسەمەد نەئەکەوتن.

مەلاعەبدولسەمەد ئەمەی پیٚ ناخۆش بوو، ڕۆژێک تووڕە ئەبیٚ و ئەڵیٚ: «تا ئەو وەختە ئێمە مانان هەبووین مەنتق و هەموو شتێکی‌تریشمان ئەوتەوە؛ ئێستە ئەوەتی ئەو گونمبەوی‌و شتە داهاتووە فەقێگەل بە ئێمە ڕازی نابن».

- «فەرەجوللابەگیبالک» عەمری خوا ئەکاو بە مەلاعەبدولسەمەدی هەجیجی ئەلێن: «قوربان پیاوێکی وەکو فەرەجوللابەگ شایانی ئەوەیە کە زاتێکی وەکو جەنابتان بیشۆن، جا فەرموو بیشۆ». ئەویش ئەلێ: «موبارەک نەبێ! لە ئێستە بە دواوە هەر کەرێک لەو چەمە بتۆپێ ئەلێن فەرموو ئەبێ زاتێکی وەکو جەنابتان بیشۆن».

- کابرایەکی ئەو دەشتی دزەییە «پیوەن»ی ولاخی لەو دەشتی فەراجە لێ ون بووبوو، ئەچوو بە شوێنا لە ناو عەرەبەکانی قەراجدا ئەگەڕا. تووشی کابرایەکی عەرەب ئەبێ لێ ئەپرسێ و تەزبێحەکەشی ئەگرێ بە دەستەوە و رای ئەوەشێنێ و ئەلێ: «یابا تۆ نەدیتە زڕ مال حێ حێ». بە خەیالی خۆی ئەمە عەرەبییە.

- کابرایەکی کورد سەردەمی گەنجێتی بە سەر چوو بوو، ئەو سەردەمەی بە سەر چوو بوو کە گەلێ گەمەو گالتەی بە دەعباکەی کردبوو ئەوەندە پشتەستوور بوو بوو پێ، لای وا بوو تا ئەو رۆژەی ماوە هەر ئەو هەڕەتەی ئەمێنێ. لە پاشا وای لێ هات نەیئەتوانی مێشی پێ دەرکا. بۆ نەگبەتی لەو کاتە شاژنێکی هێناو هێی پێ نەئەکرا. ئەمجا رووی تێکرد و بەم جۆرە دەستی کرد بە گلەیی کردن لە گەلیا و پێ وت:

تووڵەی تەڕە مار سەر سوورەی بێ خێر
تەعلەت نامەم بێ پێت نەیێژم کێر
گەزافت ئەدا من ساج ئەسمم
خاست نەسمی دەستت وە گونم
ملت شۆڕ کردگە وە بانی گونا
روو زەردیت هاورد وە شانی منا
ئەم کارە چیبوو لەگەڵت کردم
بێ فەڕەی هێزە بۆچ حەیات بردم؟
لە ناو عەشرەتا قیتەقیت کەر بووم
لە سایەی تۆوە ئێستە وە پەن بووم

- ئەڵێن: قارچکی کەما بێنن وشکی کەنەوە پاشان لە گەڵ شەکردا بیهاڕنەوە. ئەو کەسەی کرمی هەیە بەیانیان لە خورینی لێ بکا بە کەفلەمەوە بخوا هەموو کرمەکانی ئەخا.

- لە بارەی «کەمتیار»ەوە ئەڵێن:

ساڵێ نێرەو ساڵێ مێ. دوژمنایەتیەکی پیس هەیە لە بەینی ئەوو سەگدا، تەنانەت ئەگەر سێبەری بکەوێتە سەر سەگ لەترسی ئەوە کە نەوەک بیخوا ڕائەوەستێ.

هەرکە زمانی کەمتیاری پێ بێ سەگ پێی ناوێرێ. زمانی بە سەر دەرگای ماڵێکا هەڵواسن کە ئەو ماڵە شادی و زەماوەندی تێدا بێ هیچ پشێویەک لەو شادیەدا پەیدا نابێ.

هەرکە «کەڵبە»کەی هەڵگرێ و پێ بێ هێی لە فیکر ناچێ.

ئەگەر «دڵ»ەکەی بکرێ بە مندالا ئەو منالە زیرەک دەرئەچێ و زوو فێری شت ئەبێ.

ئەگەر «مێشک»ەکەی بهێنرێ بە برۆدا هەر کەسەئەو خاوەن برۆوە ببینێ خۆشی ئەوێ. وە دەستی ڕاستی ئەگەر ژن لە وەختی منال بوونا ببەستێ بە قۆڵیەوە بەئاسانی منالەکەی ئەبێ.

«چەمۆڵە»کەی ئەگەر بە هەر دارێکی بەردارا هەڵبواسرێ مەلی زیاندار توخنی ئەو دارە ناکەوێ.

«کوز»و پێستی ناوکی بە لای هەر پیاوێکەوە بێت هەر ژنێک سەیری بکا عاشقی ئەبێت و هەروەها بەلای هەر ژنێکیشەوە بێت هەر پیاوێک سەیری بکا عاشقی ئەبێت.

ئەگەر پێستی کەمتیار بکرێ بە بێژنگ و گەنمی پێ بێژنەوە ئەو گەنمە کە کرا بە «تۆ»و چانرا نە کوللە توخنی ئەکەوی نە تەیرو تیور.

«پشقل»ەکەی لە گەڵ ڕۆنی «ئاس»دا تێکەڵاو بکرێ سەری بێ توکی پێ بهەنوون توکێکی جوان دەر ئەکا.

- ئەڵێن: یەکێ مەقەست بدا بە دەست یەکێکی ترەوە ناکۆکی و ناخۆشی ئەکەوێتە بەینیان. جا بۆ ئەوە ئەمە ڕوو نەدا دێنێ ئەو کەسە کە مەقەستەکەی بە دەستەوەیەو ئەیەوێ بیدا بەویتر دەستی هەڵ ئەگێڕێتەوە مەقەستەکە ئەخاتە سەر پشتی دەستی ئنجا ئەویکە هەڵێ ئەگرێ.

- ئەڵێن: مەڕ کە بە جۆ بکەوێ واتە جۆی زۆر بخواو بیکڕێ بخرێتە ناو ئاوەوە چاک ئەبێتەوەو بەری ئەدا.
- ئەڵێن: کەر دەستی کرد بە زەڕین سەگ پشتی دێتە ژان.
- ئەڵێن: ئەگەر کەر زۆر زەڕی شتێک بئاخننە گوێیەوە ئیتر نازەڕینێ
- ئەڵێن: ئەگەر بەرازی تینوو بخەنە سەر کەر -واتە بیکەن بە باری- هەر کە کەرەکە ئاوی خواردەوە بەرازەکە ئەتۆپێ.
- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ خەوی لێ نەکەوێ -واتە دژەخەو بێ- ددانی کەر بخاتە ژێر سەری خەوی لێ ئەکەوێ.
- ئەڵێن: ئەگەر ژنێک شیری کەم بوو «سپڵ»ی کەروێشک بکاتەوەو بیهاڕی و گۆی مەمکی خۆی پێ بهەنوێ شیری زیاد ئەکا.
- ئەڵێن: کەر لەو وەختەدا کە ئەزەڕینێ ئەگەر بەردێک ببەستن بە کلکیەوە، ئیتر نازەڕینێ.
- ئەڵێن: ئەگەر منالێک زۆر گرینۆک بوو پارچەیەک لە پێستی ناوچەوانی کەر بکرێ بەو مندالەدا ئیتر ناگری.
- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ خوێنی لووتی پژاو هەر نەئەوەستایەوە هەندی سرکە بکرێ بە سەر تەرسی کەراو ئەو کەسە بۆنی پێوە بکا خوێنەکەی ئەوەستێتەوە.
- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ دووپشک پێوەی بدا بەرەوازە سواری کەر ببێ ژانەکەی نامێنێ.

**ڕێوی**

- ئەڵێن: ئەگەر شوێنێ کۆتری زۆری لێ بوو ویستیان کۆترەکان بڕۆن سەری «ڕێوی»یەک لەو شوێنە دابنرێ ئیتر کۆترەکان ئەڕۆن.
- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ فێ لێ بوو زراوی ڕێوی بێنن سەرێکی بخەنە لووتی کابرای فێدارەوە و فوو بکرێ بە سەرەکەی تریا ئیتر جارێکیکە ئەو کەسە فێ نایگرێتەوە.
- ئەڵێن: خواردنی گۆشتی ڕێوی بۆ «گول» باشە؛ واتە لە گولی ئەکەوێ.
- ئەڵێن: ئەگەر یەکێ جمگەکانی ژانی کرد، پیوی ڕێوی بتوێننەوەو ئەو جمگانەی پێ بهەنوون چاک ئەبێتەوەو ئیتر ژانی نامێنی.
- ئەڵێن: ئەگەر هێلکە گونی ڕێوی بکرێ بە شوێنێکی منالا -واتە پیا هەڵواسرێ- ئەو منالە زۆر بە بێ ئازار دان دەر ئەکا.

- ئەڵێن: ئەگەر بە خوێنی ڕێوی سەری مناڵ بهەنوون سەری موو دەر ئەکا، ئەگەر کەچەڵیش بێت.
- ئەڵێن ئەگەر کەڵبەی ڕێوی -واتە ددانەکانی تەنیشتی- هەڵبواسرێ بە فێدار فێیەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.
- ئەڵێن ئەگەر یەکێ سپڵی هەبوو ئازاری ئەدا سپڵی ڕێوی بخاتە سەر لە کۆڵی ئەکەوێ.
- ئەڵێن ئەگەر یەکێ گوێی هاتە ژان، پیوی ڕێوی بتوێننەوەو تێی کەن ژانەکەی ئەشکێ.
- ئەڵێن ئەگەر یەکێ ئازاری سپڵی هەبوو تۆزێ لە دڵی ڕێوی تێکەڵاو بکا لەگەڵ بە ئەندازەی مسقاڵێ شەراب و بیخواتەوە ئازارەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.
- ئەڵێن ئەگەر میشکی ڕێوی لەگەڵی «وەرەس»[٢٥] تێکەڵاو بکرێ ئەو کەسەی کە سەری کرێژی هەیە وەیا زیبکەی هەیە، وەیا کەچەڵە، وەیا مووی ئەڕزێ بەو دەرمانە بیهەنوێ ئەوانەی هەموو لە کۆڵ ئەکەوێ.

## گورگ

- ئەڵێن ئەگەر سەری گورگ هەڵواسن بەو شوێنەدا کە کۆتر و پەلەوەری لێیە نە پشیلەو نە دەعبایتر ناچێتە ئەو شوێنە بۆ خواردنیان.
- ئەڵێن ئەگەر یەکێ کەڵبە وە یا چاو وە یا پێستی گورگی پێ بێ زاڵ ئەبێ بە سەر دوژمنیا و هەموو کەسیش خۆشی ئەوێ.
- ئەڵێن ئەگەر کلکی گورگ لە «کادان»دا بێ نە گا نە کەر نە مەڕ و نە بزن ناچن بۆ خواردنی ئەو کایە.
- ئەڵێن ئەگەر پێستی گورگ و مەڕ پێکەوە کۆ بنەوە هەموو تووکی پێستە مەڕەکە هەڵئەوەرێ.
- ئەڵێن ئەگەر یەکێ بیکا بە عادەت و هەر لە سەر کەوڵی گورگ دانیشێ تووشی کولنج نابێ.

---

٢٥- وەرەس گیایەکە زۆرتر لە یەمەندا ئەڕوێ. تۆوەکەی وەکو تۆوی کونجی وایە، کە گەیشت شەق ئەباو هەودای وەکو هی زەعفەرانی لێوە دەرئەچێ. بەو هەودایانە شت ڕەنگ ئەکرێ.

- ئەڵێن ئەگەر پێستی گورگ بکرێ بە تەپڵ، ئەو تەپڵە لەناو هەرچەند تەپڵیترا بێ کە لێ درا هەموو تەپڵەکانی تر ئەدرێن.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێ تووشی مەوەرزە بوو بە پیوی گورگ خۆی بهەنوێ ئەو دەردەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێ فێدار بوو چاوی گورگ هەڵبگرێ لەگەڵ خۆیا فێداریەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

- ئەڵێن گوێی گورگ وردە ئێسکی تێدایە وەکو تەرسی گا و وشتر. جا ئەگەر یەکێ ددانی هاتە ژان یەکێ لەو وردە ئێسکە بهێنێری بە ددانیا ژانەکەی ئەشکێ.

- ئەڵێن ئەگەر تۆزێ لە زراوی گورگ لە گەڵ تۆزێک هەنگوینی ئاگر نەدیودا تێکەڵاو بکرێ و بهێنرێ بە چاوا شەو کوێری و کەم حوکمی چاو لائەبا.

- ئەڵێن ئەگەر کلکی گورگ بە ناوی ئافرەتێکەوە گرێ بدرێ ئەو ئافرەتە کەس ناتوانێ بچێتە لای تا ئەو گرێیە نەکرێتەو واتە کابرا ئەبەسترێ.

- ئەڵێن گورگ کە بریندار کراو خوێنی لێهات و ئنجا ڕۆیشت، گورگیتر کە چاویان پێکەوت ئەیخۆن.

- ئەڵێن ئەگەر تووشی رەوە گورگ بوویت و پەلاماریان دایت ئیشێکی وا بکە یەکێکیان لێ بریندار کەیت. هەر کە خوێنی لێهات ئیتر گورگەکانیتر بەر ئەبنە ئەو، ئەو ئەخۆن و واز لە تۆ دێنن، بەو جۆرە تۆ رزگارت ئەبێ.

- ئەڵێن یەکێ کە بەرد لە میزڵدانیا بوو گوڵی گەنمەشامی بۆ بکوڵێنن وەکو چا بیخواتەوە بەردەکەی نامێنێ.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێ خوێنی لووتی پژا، بۆن بە تەرسە قوڵەوە بکا خوێنەکە ئەوەستێتەوە.

- ئەڵێن ئەوی «ئاگرە»ئەستێ بێنن کابرایەک کە گورگی کوشتووە بە کوردی ئەڵێ ئەبێ بە دەستی بێ بێنێ پڕ دەمی بکا لە ئاوی سماق و بیپرژێنێ بەو شوێنەدا کە ئاگرەکەی لێ هاتووە. پاشان بە بەرد و ئەستێ لە بەر برینەکەدا بەرد و ئەستیەک هەڵبکا پزیسکی بەرد و ئەستیەکەی لێ بکەوێ ئیتر چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن ئەو منداڵەی کە تووشی خەرکانە ئەبێ ژنێک کە بە دەستی بێ بێنێ پارچە کاغەزێکی شینی شەکر ئەخاتە سەر ناو چەوانی منداڵەکەو «عەقیق»ێک گەرم ئەکاو

ئەیخاتە سەر کاغەزەکە. خەرکانە کەوشک ئەکا ئەم ئیشەش ئەبێ لە رۆژی چوارشەممەدا بێت.

– ئەڵێن ئەو منداڵەی تووشی برینی ئاگرە ئەبێ بێنن جۆ لە سەر ساج بسووتێنن پاشان سماق ناوکەکەی لێ بکرێتەوە، توێکڵە تورشەکەی لەگەڵ ئەو جۆە سووتاوەدا پێکەوە بیانکوتن و لێ بنێن چاک ئەبێتەوە.

– ئەڵێن ئەگەر یەکێ چاوی ژان بکا و بئاوسێ و ئاو بکا، بەز و گۆشت پێکەوە بکوتن و بیخەنە سەری چاک ئەبێتەوە.

– ئەڵێن ئەگەر یەکێ چاوی تێک بچێ و ژان بکا و بئاوسێ سەر تۆی ماست بخەنە سەر لۆکەو شەوێ لە کاتی نووستندا بیخەنە سەری چاک ئەبێتەوە.

– ئەڵێن ئەگەر یەکێ چاوی تێکچوو بێنێ سەرگوڵی چای کە لێ ئەنرێ لە ناو ژێرپیاڵەیەکدا ساردی کاتەوە دوو سێ جار هەر جارە یەک دوو دڵۆپی تێکا چاک ئەبێتەوە.

– ئەڵێن ئەگەر یەکێ چاوی تێکچوو «تڵپە»چای بگوشێ و بە شەو بیخاتە سەر چاوی بیبەستێ چاک ئەبێتەوە.

– ئەڵێن ئەگەر یەکێک موو لە پەنجەی هات «بنێشتەتاڵ» لەگەڵ «سابوونی رەقی» سابوونەکە ورد بکرێت و پێکەوە بکرێن بە مەعجون و لێنێن چاک ئەبێتەوە.

– ئەڵێن شیرەی ئەسپەناخ و شەکر تێکەڵاو بکرێن و بخورێن ژانە سەر لائەبا.

– ئەڵێن یەکێ مێزی بگیرێ ئەسپەناخ بە کاڵی بخوا مێز گیرانەکەی لائەچێ.

– ئەڵێن یەکێ گەروو مەڵاشووی ژان بکا گیای ئەسپەناخ بە کاڵی بخوا رزگاری ئەبێ.

– ئەڵێن یەکێ شەنگەسوورەو زەردەواڵە پێوەی بدا ئەسپەناخ بکوڵێنن و بیخەنە سەر شوێنەکەی چاک ئەبێتەوە.

– ئەڵێن یەکێ دمەڵی لێ هاتبێ هەر دەرگای نەبێ هەندێ ئەسپەناخی کوڵاوی بخرێتە سەر زوو دەرگای ئەبێ.

– ئەڵێن خواردنی گیای ئەسپەناخ بۆ نەخۆشی سنگ و وەرەم و تای گران و تینوێتی زۆر بە کەڵکە.

– ئەڵێن یەکێ سپڵی هەبوو خۆی لە خواردنی ئەسپەناخ بپارێزێ.

– ئەڵێن گیانلەبەری گەڕ لە هەر کە بکەوێ ئەو کەسە تەمەنی کورت ئەبێ.

- ئەڵێن یەکێ خەوی دی بە شەو نەگێڕیتەوەوە ئەگەر یەکێکی وای دەست نەکەوت کە بزانێ چۆن بۆی لێک ئەداتەوە لە سەر ئاوێکی رووناک و پاک بیگێڕیتەوە.

- ئەڵێن ئاوی دەباخانەو ئاوی نێرگەلە بڕێژرێتە ماڵێکەوە کە جادووی تیا کراوە جادووەکە بەتاڵ ئەبێتەوە.

- ئەڵێن کوڕی مناڵ بخرێتە باوەشی بووکەوە نۆسکەی ئەو بووکە کوڕ ئەبێ.

- ئەڵێن کلاو بە هەڵگەڕاوەیی گەسێک لە سەر سەر دانان خراپەو شوومی دێنێ.

- ئەڵێن یەکێ ئەگەر گوێی راستی بزرینگێتەوە ئەوە باسی ئەکەن ئەگەر گوێی چەپی بزرینگێتەوە ئەوە گۆڕ بانگی ئەکا.

- ئەڵێن ئەگەر یەکێ خۆشەویستێکی لە ولاتێکی دوور بوو هیچ خەبەرێکی نەبوو سەر لە بەیانیک بچێتە سەر سێ ڕێانێک سێ بەرد فڕێ بدا بە نیازی هەواڵێکی خۆشی خۆشەویستەکەی پاش ئەوە گوێ لە هاتوچۆ کەران بگرێ. یەکەم شتێک کە گوێی لێ ئەبێ ئەگەر شتێکی چاک و خۆش بوو ئەوە خۆشەویستەکەی ماوەو لە خۆشیدایە، خۆ ئەگەر گوێی لە شتێکی خراپ بوو ئەوە خۆشەویستەکەی لە ناخۆشی دایە وە یا مردووە.

- ئەڵێن هەور بۆ لەش سووتاو ئازاری زۆر ئەبێ.

- ئەڵێن پێستی سمۆرە بکرێ بە کیسەپارە سەر بە رزق ئەبێ.

- ئەڵێن ئێسکی پەپوسولەیمانە بخرێتە ناو کیسەپارەوە، ئەو کیسەیە پارەی لێ نابرێ.

- ئەڵێن یەکێ تووشی کۆکەڕەشە ببێ شیری کەری بدرێتێ چاک ئەبێتەوە.

- ئەڵێن لە ڕێ و بانا مار چاوی بڕیە ئافرەتی سکپڕ ئەو سکە کوڕ ئەبێ،

- ئەڵێن: کە با زۆر بوو تازە بوکێک بچێتە سەربان «باگردێن»یک راست بکاتەوە بایەکە ئەوەستێتەوە.

- ئەڵێن کە باران نەبارێ بەیداخی دار شەخسێک بێنن و لە ناو بیرێکا رای وەستێنن و پاشان بەرد بخەنە ناو بیرەکە باران ئەبارێ.

- ئەڵێن کە بێ بارانی بوو پیاو چاکێکی لە خوا ترس بگرن و بیخەنە حەوزەوە باران ئەبارێ.

- کە باران نەباری لەو ولاتی کوردەواری یە بوکەبارانی ئەکەن:

بووکە بارانی ئەوەیە کە منالان داریکی درێژ دێنن و چیتی زەرد و سووری پێوە ئەبەستن و بە مالانا ئەسووڕێنەوە. کە چوونە هەر مالیک کابانی ئەو ماڵە دێنێ لە سەرەوە ئاو ئەپرژێنی لە بووکە بە بارانەکەو دەست ئەبەن شتێکی ئەدەن بە منالەکان. هەروەها دێنن

لەماڵەکان دەرزیش ئەدەن لە بووکە بە بارانەکە تا ئەم منالانە گەڕەک وە یا گوندەکە تەواو ئەکەن یا نایکەن باران دەست ئەکا بە بارین تا بارانەکە ئەباریٚ بووکە بە بارانەکە لە بەر ئاو لێ پڕژانی ماڵەکان بە تەواوی تەڕ ئەبیٚ. منالەکانیش کە ئەچنە بەر دەرگای خەڵک ئەم بەستەیە ئەڵێن: لە هەورامان ئەڵێن:

یا خوا وارۆ پەی خەڵەی گیواو بزیو پەی گەڵەی

لەو وڵاتی هەولێرە ئەڵێن:

هەباران مەباران یاخوا بباریٚ باران گەنمی حەسەن و حوسەینا هەموو قڕبوون لە تینان

لە وڵاتەکانی تر ئەڵێن:

هەناران مەناران یاخوا داکاتە باران

گەنم و جۆ بیٚ بۆ شاران کەسمان نەمریٚ لە برسان

## ژیانی عەلائەدین سەجادی

عەلائـەدین کـوڕی نەجمـەدین کـوڕی حیـسامەدین لـە بنەماڵـەی سەجادی، لە ساڵی ١٩٠٧ دا لە گەڕەکی قەتارچیانی شاری سنە چاوی کردەوە بە سەر دونیای رەنگاورەنگی پڕ لە کارەساتدا. بە سوختەیی خوێندنی دەست پێکردووەو بە فەقێتی گەلی شارو دێی کوردەواری گەڕاوەو بنەو بارگەی لە سلێمانی خستووە. لە ساڵی ١٩٣٨ ئیجازەی زانستە ئیسلامییەکان و زمانی عەرەبی وەرگرتووەو دواجار بۆ مەلایەتی و پێش‌نوێژی لە مزگەوتی نەعیمە خاتوون رووی کردۆتە بەغداو هەر لەوێ ماوەتەوە.

لە ماوەی شەڕی دووەمی جیهانیدا خێی داوەتە رۆژنامەوانی و گۆڤاری «گەلاوێژ»و «نزار»ی بەڕێوە بردووە. لە ١٩٥٩دا بۆتە مامۆستای زانکۆی بەغدا لە کۆلێژی زمانی کوردیداو تا ساڵی ١٩٧٤ لە سەر ئەم ئیشە ماوەتەوە. لە ١٩٧٠ دەبێتە وەزیری ئەوقاف. لە ١٩٧٧دا خانەنشین دەکرێ.

پاش خانەنشین بوونی هەموو هێزو توانی دەخاتە سەر کار لە سەر بابەتی ئەدەبی کوردی؛ بەڵام کوژرانی کوڕی گەورەی لە شەڕی ئێران و ئێراق (١٩٨٠-١٩٨٨)دا وزەی دەبڕێ و پشتی دەشکێنێ. تا لە ساڵی ١٩٨٤دا روو لە شاری خامۆشان دەنێ و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی ئەسپەردە دەکرێ.